پێشکەش بە:

دایکم سەیدزادە مەلەک، باوکم مامەسوار، خاڵم سەید محێدین،

کاک ئەحمەد بەحری کە دە مانای فۆلکلۆری گەیاندم

و

سەرجەم هۆگران و لایەنگرانی فەرهەنگ و کەلەپووری باب و باپیران.

ڕێز و سڵاو و سپاسی خۆم پێشکەشی ئەو خوشک و برایانە دەکەم کە لە پێکهێنانی ئەم بەرهەمە یاریدەیان داوم بە تایبەت:
خوشکان پەری عەزیزئامان، کوردستان نوورانی
برایان لوقمان سەعیدیان، ئەمین گەردیگلانی، یۆسف کاکەمەمی، حەسەن شوان، مستەفا ئەحمەدزادە، ئەحمەد چەمیدە، کەماڵ باپیری،
فەرهادفەرامەرزی، سەلاحەددین ئاشتی و سامان سەمەدی

نێوەرۆک

**لایەلایە** .................................................. ١
**منداڵ لاواندنەوە** .................................... ١٠
**کایەی منداڵان** ......................................... ٢٧
**گۆرانی ژنان** ............................................ ٣٦
**گۆرانی پیاوان** ......................................... ٦٦
**گۆرانی هەڵپەڕکێ** .................................. ١٥٢
**گۆرانی کار** ............................................ ١٧٧
**حەیرانی ژنان** ........................................ ٢٠١
**شینگێڕی** ................................................ ٢١٤

خەجێ نان‌نەخۆر

هەی لایە لایە لای دە «غەیبەر»ێ
ئەوە رۆژ لە بورجی منەووەر سەر دێنێتەوە دەرێ
یا خولا خاڵ و مامی تۆم بێمزەڕەت بێنەوە لە وێ سەفەرێ

وەرە رۆڵە لای‌لاییت بۆ دەکەمەوە بە نادری
دەتبەمەوە سەر چاکان، سەر پیران
ناوەڵلا سەر گومبەزی دە «شێخ عەبدولقادر»ی
ئەمن تەمەننا دەکەم لە خودای رۆڵە قەت لە من نەمری
❁ وەرە رۆڵە رێگاکەت دوورە و گەلێک هەورازە
چاوێکت شەهێنە و یەکیانت بازە
لەسەر دایکی خۆت مەکەوە نازە
❁ لانکێکت بۆ دروست دەکەمەوە لە داری دە وێنێ
وەستایانت بۆ دێنم لە «کۆ» و «حەڵەب»ێ
دەسرازەت بۆ دێنمەوە لە «قەزوێن»ێ
لە خودام تەڵەبە قەت نەگەوزێیەوە لە گۆمیلکەی دە خوێنێ.
ئەوە ئەورۆکانە داتدەپێچمەوە، داتدەنێمەوە لە سەر کەوێ
هێندەت لای‌لایی بۆ دەکەم هەتا خەوت لێ دەکەوێ
ئەمن دەچمە کن نەججاڕان
لانکێکت بۆ دەکڕم لەوانی دە خڕخاڵدار ئەگەر وەگیرم بکەوێ
❁ ئەوە لە کوێستانان دێتەوە قاسپە قاسپی دە کەوێ

نازانم نەگرمەی دە رواچییانە، نە هۆ هۆی جوتیارانە لە سەر زەویٚ
وەرە رۆڵە خەوی خێرێت بیٚ
ئەوە مەڕی دە نیوەڕۆیە دێتەوە سەر چێشتەنگەویٚ
نازانم نە خرمەی بازنە و خڕخاڵی دە شەنگەبێریانە
وە قاپ و مەنجەڵان دەکەویٚ
❁ ئەمن لانکێکت بۆ دروست دەکەم لە داری دە قەزوانیٚ
لای لایەکت بۆ دەکەم مەگەر خودا بزانیٚ
وەستایانت بۆ دێنم لە «شنۆ»یە
دەسرازەت بۆ دێنم لە «کۆنە لاجان»یٚ
سەردەمەت بۆ دێنمەوە لە «گرشیلان»یٚ
ئەوە جەنگەی بێر و بانەمەڕان هەڵتدەگرمەوە بە چارۆکیٚ
دەتپێچمەوە بە کوڵوانیٚ
❁ ئەوە مەڕ دەلەوەڕێتەوە لە «چەکوچ» و «ماڵۆک»ی
ناوەڵلا لە «سێکۆیان»یٚ
ئەمن هەڵتدەگرم بۆ «سەهەند» و «ماینبلاغ»ی
ناوەڵلا لە بۆ کوێستانیٚ
وەرە رۆڵە ئەسپاردەی خودای بی و بۆ من ببیەوە پیاوەکەی دەرک و دیوانیٚ
❁ ئەستێرێک هەڵدیٚ لە لای «مەراغ»یٚ
دەداتەوە لە کۆشکان، پەنجەران، دوو دەریٚ دە پیرە «سابلاغ»یٚ
رەببی رۆڵە عومرت هەزار ساڵ بیٚ و بۆ من ببیەوە بەردی بناغیٚ
❁ رۆڵە گیان! بۆچی لە شای بووی یاغی

راوەکەت هەڵگرت بۆ «یاجیبڵاغ»ی
یا خوڵا بتبینم هەر بە لەش ساغی

ئامین پینەچی

چەند چاک و پیرت بۆ دەخولامەوە
لەبەر سێبەرت نەحەسامەوە
ئەمن لانکۆڵەکەی خۆم هەڵدەگرمەوە
دەیبەمەوە بن داری دە گوێزێ
بە سەری هەڵدەکێشمەوە «چیت» نمرەی دە «تەوریێز»ێ.
ئەمن لانکۆڵەکەی خۆم هەڵدەگرمەوە
دەیبەمەوە بن داری دە خورمایە
بە سەری هەڵدەکێشمەوە «چیت»، نمرەی دە «بەغدا»یە
ڕۆڵە لایە! ڕۆڵە لایە! بابی دایە!
ئەتۆ بۆچی خەوت نایە؟
دە بنوو ڕۆڵە خەوی خێرت بێ
نوشتووی پیاو چاکان لە ژوور سەرت بێ
ئەمن لانکۆڵەکەی خۆم هەڵدەگرمەوە
دەیبەمەوە بن داری دە بییە
بە سەرت هەڵدەکێشمەوە بەرماڵی دە کەشکۆڵییە.
چەند چاک و پیرت بۆ خولامەوە
لەبەر سێبەرت بحەسێمەوە
وەرە لایی، وەرە لایی، بۆ لە خەوت نەبانی؟
یارەبی ڕۆڵە نەمری بۆ خاتری «غەوسی سانی»
خۆزگەم بە مەلان هەر شەو لە شاخێ

نەک بە دەستەی خۆم هەر ئاخ و داخێ
بە تانەی دۆست و بێگانەکان خۆم
بە وێنەی «مەجنوون» وێڵی کێوان خۆم
ئازیز بە مەرگت گرانە دەردم
کاتێ بژنەوە ئەوە من مردم
ئەمن لای‌لاییت بۆ دەکەم خەوی خێرێت بێ
نووشتەی «سەید محەممەد نوورانی» لە ژوور سەرت بێ
لای‌لاییت بۆ دەکەم بە عەبداڵی کۆ
هیچ کەسێک نەگرێ نەدامەتی نۆ.
ئەوە لانک داران لانکی خۆیان هەڵدەگرتن
وەبەر هەوراز و نشێوی دە کوێستانان دەکەوتن
ئەوە لانک و بێشکەی دە بێ دای و باب
لەبەر سوورەتاوی هاوینان دەکەوتن.
رەوارەی لانکێت دەکەمەوە دە زریانی
بەشقم سۆزێک بێ بە شنە شنەی بای دە شەماڵی
ئەوە کوێستانانم زۆر لێ فێنکە
هەوارە پایزانم دێنەوە سەر کۆل و بیرانی
هەی لایە، لایە، بۆ خەوت نایە؟
دەردت لە بابم، قەزات لە دایە
خودا و پێغەمبەر ئاگادارتان بێ
ئەو دایکە پیرە بە قوربانتان بێ

ئایشێ حەلیحەیزی

هەی لایەلایە، لایی لە عەڕشێ
یا خولا خودات بە دای و بابی دە خۆ ببەخشێ
❁ هەی لایە لایە، لایی لە دنێ
دەشتی «قەراج» و «شەمامک»ان هەر لە من کەوتنێ
ئەمن دەرمانێکی دەگرمەوە لە هێلێ، لە دارچینێ و لە میخەکێ
دەیهاوێمەوە سەر برینی دە شەهیدان
لەبەر گزینگی دە تاوێ، لەبەر خوناوەی دە بارانێ هەر نەهێنن تەشەنێ
❁ لایی لایی، لا ئیلاهە ئیللەڵلایە
هەر چەند دەکەم و دەکرێنم
لانکی تۆ رادەژێنم هەر لە نێو کایە
هەر چەند دەکەم و دەکرێنم
لەبەر خوناوەی دە بارانێ و لە بەر شیبای دە شەماڵێت خەو نایە
هاوار دەکەمە پێغەمبەری ئاخری زەمانی
بە دوور بی لە دەردێ، لە بەڵایە

هاجەر کولتەپەیی

گەر ملت دێشێ بە پەتی زاڵم
سەرکە سەر رانم قەزات لە ماڵم
❁لایی‌لاییت بۆ دەکەم بە رەشتەوە
نەمێنی رۆڵە شەو لە دەشتەوە
❁ لایی‌لایی خەڵکی بە سەر زمانە
لایی‌لایی دایکت بە دڵ و بەگیانە
❁ لایی‌لاییت بۆ دەکەم بە دڵ و بە گیان
خەوت لێبکەوێ هەتا بەر بەیان
❁ لایی‌لاییت بۆ دەکەم خەو بتباتەوە
فریشتەی خێران خەبەر کاتەوە
❁ لایی‌لاییت بۆ دەکەم بە رووی سوورەوە
خوا جەرگەم نەدا بە تەندوورەوە
❁ لایی‌لاییت بۆ دەکەم بە دڵ و بە گیان
ئاگادارت بێ شێخی «کەس نەزان»
❁ سەت دارم لێدەن، داری مێمووکێ
لانکت هەڵدەگرم دەچمە «کەرکووک»ێ
❁ ماڵم بۆچی‌یە؟ گەنجی بەکۆ بێ
گەدایی دەکەم چاوم لە تۆ بێ
❁ یا سوڵتانی ماڵ لەو قەد و بەرزە
کۆرپەکەم نەگرێ قەت تەب و لەرزە

❁ لایی‌لاییت بۆ دەکەم بە دڵ و بە گیان
خوا بتپارێزێ لە بەڵای «رەزاخان»

بۆ کوڕان

بە سرنجدان بەوەی کە وێژەری ئەم
بەندانە چەند کەسێکی دیاریکراو نین بۆیە لە ناوهێنانیان خۆ دەبوێرین.

سەر زینی ماینێی شڕە
بن زینی ماینێی شڕە
دۆستی کچە «مەنگوڕ»ە
❁ من کاریَ ناکەم چڵکە
تەشیَ ناڕێسم کوڵکە
ئەو کوڕەی بەخێو کەم مڵکە
❁ هەلاڵەی هەڵوەردان
گوڵی نێو شێوەردان
کوڕی گەردن زەردان
❁ هەلاڵەی هەرمنیَ
گوڵی دەستەچنیَ
کوڕی پیرێژنیَ
❁ دەبەرت مرم لاوژە
باری کەرێت مێوژە
خوایە کوڕم مەکوژە

❁ خولا داویَ خولایی
کەوای «قوتنی دارایی»
کرمانجە و رەنگ ئاغایی
❁ چەندم خولا خولا کرد
کۆشێکم زێڕ بە با کرد
تا ئەو کوڕەم پەیدا کرد
❁ نینی نینی نین دەکا
داوای ئەسپ و زین دەکا
بابی نەمرێ بۆی دەکا
❁ داران بەریان بە بەرە
کێ کوڕێکی وای لەبەرە؟
هەموو گیانی گەوهەرە
❁ داران بەریان لەبەر بێ
دوژمن خۆڵی لە سەر بێ
«هاجەر» کوڕی لەبەر بێ
❁ کچان مەچن بۆ ناو دار
کوڕم شێتە و کڵاو لار
دەتانخا پشتەو قەفار
❁ بە شنەشن و بە خنەخن
دیوارەکان بکە کون
بچۆ ماڵە مەلاژن
❁ بە قوربان و بە سایە

کورم دێتۆ لە کایە
هەڵدێ بۆ باوەش دایە
❁ خودای لە ژووری سەرم
گەورە کا کۆرپەی بەرم
ببێ بە حاجەتکەرم
❁ ... و ...کەی دەهێشتە
کچۆلان دەیانچێشتە
پێیان وابوو بنێشتە
❁ شەکری لە شاری دە دوور
خەنەی بۆ بسکی دە سوور
پێی خەنی بوون دایک و پوور
❁ ... و ...ی دە لاوان
کیژان دەیکرن بە دراوان
بۆ کلچووکی دە چاوان
❁ شەکری لە «شارستێن»ێ
گەزۆی لە «دار لاوێن»ێ
خولا لە منت نەستێنێ
❁ خودا خەنیم کا خەڕۆ
جاچکە هاتووە بە پەڕۆ
کەس نەڵێ کۆرپەڵەم ڕۆ
❁ دە بەرت مرم کاکە
بەژنت لە زێڕی پاکە

چەن ژنت بۆ بێنم چاکە
❁ کوڕم تۆ کوڕێکی لاوی
سۆنەی گەردن مراوی
کێ بەردی پێداداوی؟
❁ ماڵە بابم منۆڵێ
کوڕ هەڵبگرێ زەردۆڵێ
کیژی بۆ بدەم لە تۆڵێ
❁ قەزات لە خۆم لەوانە
بە رۆژ دەچنە کۆڵانە
بە شەو دەبنە دێوانە
❁ کوڕەکەم هاتووە لە تیشی
لە پەلکی گوڵان دەنیشی
بۆ خۆی جوانە و خاڵیشی
❁ داران بەریان تۆڵەکە
دوژمن خۆڵێ وەسەر کا
خوڵا نەمرێ رۆڵەکە
❁ لە کێ بووە لەوانە
بابی مەزنی دیوانە
دایکی ورچی تەلانە
❁ خودایە گیان خودایە
هەڵت کردووە چرایە
نەمخەیە تاریکایە

❁ دەبەرت مرم بەرینێ
کورتێ کراس نەخشینێ
دایک مەرگت نەبینێ
❁ دەبەرت مرم بەری شێ
ریحانە دەگرێ تیشێ
میوانی پوورە «ئایشێ»
❁ دەبەرت مرم لاوە
بەژنت گیابەند و خاوە
دایک لێت بکا سلاوە
❁ دەبەرت مرم لاوێرە
دەسکی گولاّن کەنێرە
بۆ کچۆلاّن وەرە ئێرە
❁ بە قوربانت بم بەشێ
هەنگوینی کانی رەشێ
بە حەوت دەرمانان دەشێ
❁ هە کورە کوڕانت بینم
لە خڕ و دۆلاّنت بینم
لەگەڵ کچانت بینم
❁ مالاّن مالّیان نەشێوێ
بەهارە و خاکەلێوێ
خەرمانی گولاّن دەپێوێ
کوڕی من دەشتە نێوێ

❁ به قوربانت دەبمەوە
لە کچانت دەستێنمەوە
لە شارانت دێنمەوە
بە یارانت دەسپێرمەوە
❁ کەوا و پاتۆڵ ئەفسەری
پشتێن چیتی «کودەری»
بە قوربانت بم «شوانە»
میرزاکەی سەر دەفتەری
❁ نینی نینی نینکەڵە
هەنگوین و رۆن تێکەڵە
دەستی فێرە باغەڵە
ئەو کوڕە فێرە گۆنگەڵە
❁ نینی نینی رووباری
بەند کۆچکۆڵەی مرواری
ببی بە حاکمی شاری
نەتبینم بە هەژاری
❁ لە ولـولان، لـە ولولان
دەبەر بۆرێت کەم زەنگولان
دەشتە راوی «میر غەولان»
لە دووت بینم تاجی و تولان
❁ ئۆخەی ئۆخەی کوڕەکەم
سەر زین ئەسپە شڕەکە

ژنێک بێنە دەرم کە
چێشتێ لێنێ بانگم کە
❁ قوربانت بم لە کوێ بووی
لە باخەکەی بەر دێ بووی
لە ناو سوێسنە و مەندێ بووی
لە باخەڵی ڕەندێ بووی
❁ تیژی دەڵێی گوێزانی
لووسی دەڵێی هەسانی
جوانوو ماینی «کاکل‌ئاغا»ی
فێری تەقڵە و لینگ دانی
❁ ماڵ و حاڵم بە تەنێ
جڵەوداری قۆشەنێ
دوژمن کوێر بن نەتگەنێ
لێت دەکەن فێڵ و فەنێ
❁ هەمیشە و هەمیشە
گەردن گوڵاوی شیشە
تۆز لە باڵای مەنیشە
کچەگەل بۆ تۆ مەخشووشە
❁ دەبەرت مرن مەڕاڵان
گەنمە سوورەی دە چاڵان
یاخودا بە قوربانت بن
تایفەی مام و خاڵان

❁ دەبەرت مرم کوڕەکە
بێستانەکە لە بڕەکە
هەمووی شووتی و کاڵەکە
بۆ دایکتی لێوەکە

❁ لاوی لە ژنە «گۆران»ی
شەشپەڕ دەسکە ریحانی
لە کچۆڵان دەگری مانی
درەنگ بۆی دەچییە ژوانی

❁ نینی نینی نینۆڵێ
ئەسپان دەکەن سمکۆڵێ
کورم هەڵدەگرێ ژنۆڵێ
«گولێ»ی دەدەم لە تۆڵێ

❁ هەوارمان دەڕوا بۆ «لکبن»ی
کەپرێ دەکا لە سوێسنی
بەشێ خۆمی و لانکی ژنی
نەنێ بمرێ نایە بنی

❁ نیسک جارە لە «بیتوێن»ێ
لانکی ئەو کوڕەم نەبەمە کادێنێ
دەسرازەی نەکەم دە دەسبێنێ
خودای لە ژووری سەری
ئەو کوڕەم لێ نەستێنێ

❁ کوڕم بە قوربانت بم

هاوڕێی شەوەکانت بم
سابوونی جلانت بم
بە شوانی بەرخانت بم
بە گوڵینگی چەکمانت بم
❁ بە قوربانت بم لاوە
گای لە جووتی گێڕاوە
دای بە زین و لغاوە
خوشکی لە سەر داناوە
ئەو بۆ خۆی بە ژن داوە
❁ هە کوڕە نان و هە کوڕە دۆ
بەرەغەل باژوێ بەرەو جۆ
دار سەندەڵ گۆچانی تۆ
«مەراغە» مەیدانی تۆ
دایە بە قوربانی تۆ
❁ خڕەکە خڕەکە بە ڕێدا
بەلای ماڵی نەنێدا
«سیامەند» گیانم چی دەوێ؟
تۆپێکی قوتنی دەوێ
بیکا بە سوخمەی شەوێ
دەگەڵ یارێ وەرکەوێ
❁ لە کێ دەچێ چەمانی
لە خاڵی شا جوانی

له کێ دەچێ ڕەوشتی
له خاڵی شیر له پشتی
له کێ دەچێ لووتەکەی
له مامە دەویدەکەی!
❁ هاوار هاوار داکەوت
کوڕم دە شەڕی شای کەوت
فۆتەی لێ دەملان کەوت
دایکی دەڵێ هاوار له من
بابی دەڵێ سەڵا له من
ژنەکەی دەڵێ تێیهەڵدەن
شەوێ پشت دەکا له من
❁ ئەگەر بژیم بمێنم
حەوت ژنانت بۆ دێنم
یەک زەردی بەر کولێنێ
یەک نانی داتەپێنێ
یەک گونانت هەڵسەنگێنێ
یەکیان تورکی تەماشا
یەکیان دوختەری پاشا
❁ له هەموو ماڵان دە و دوو
له ژنی داوێن بە گوو
هەر چی هات و زوویان بوو
هەمووی گەند و گوویان بوو

ئەمن زۆر درەنگم بوو
بازم لە سەر چنگان بوو
شەمامەی چل رەنگم بوو
❁ ئەوەی پێت دەڵێ پیسە
لێی ون بێ قەننە و کیسە
ئەوەی دەڵێ ناحەزە
پێوەیدا هەڵەپەزە
ئەوەی دەڵێ دزێوە
خرای بێ زار و لێوە
ئەوەی لێت دەکا تووکێ
کرمی کەوێتە پووکێ
ئەوی دەکا دوعایە
کرمی کەوێتە حەیایە
❁ حەوت جار بیست گامێش قوربانی خێر بێ
ئەڵلا لە رێی تۆ کورم نێودێر بێ

بۆ کچان

دەسکە گوڵ و ریحانە
ماڵم بە تۆوە جوانە
❁ دەسکە گوڵ و وەنەوشە
ماڵم بە تۆوە خۆشە
❁ ئەو کچە جوانەی بە نامووس
دێنە سەری «میر کاووس»
پێشکەشی ئەسپی گوێ لووس
❁ خودا داوییە لە خێران
مانگی دەگەڵ ئەستێران
دەرمانی شەل و کوێران
❁ مەڕێ ببینم لە سەر مۆڵێ
ئەسپێ ببینم لە پێکۆڵێ
خانمێ ببینم کوڕ لە کۆڵێ
❁ ئۆخەی، ئۆخەی، ئۆخەی‌لێ
داران بەریان سیوەیلێ
«مەجنوون»ە دۆستی «لەیلێ»
❁ ئۆخەی نەرمونۆڵەکە
داران بەریان تۆڵەکە
کەس نەیمری رۆڵەکە
❁ خانمە خڕەی «میرەدێ»

بۆنی مێخەکبەندی دێ
ئەو گوڵە سوورەی «سەهەند»ێ
❁ قوربانت بم قوربانیلە
سێوە سوورەی سەر کانیلە
عالەم بۆ ماچی تۆ دیلە
❁ ماڵە خودای بێ ئاوا
بێستانی سوور و ساوا
چ پووڵمان پێنەداوە
❁ ئەو کچە جوانە بە حەل حەل
دێنە سەری «میراودەل»
پێشکەشی ئەسپی گوێ بەل
❁ نینی نینی نیناوا
دەینێم لە تای کەژاوە
بۆ کوڕی حاکمی رۆژئاوا
❁ خرپانێ و خرپانێ
رێگای کانیە نازانێ
گۆزەی گرانە و نایتوانێ
❁ خودا داوێنی وەشان
لە زێڕی سووری نەخشان
بەشی خستمە نێو بەشان
❁ دەبەرت مرم بەرینێ
مەڵحەمی بۆ برینێ

دایـک مـەرگـت نەبینـێ
❁ دەبەرت مرم ئەوەندە
بەژنت ریحانەی «لەند»ە
ماچت وەک حەتر و قەندە
❁ بە کەشکاوم بۆ بێنە
لەسەر قەبرم بچێنە
کەس نەما بۆ خۆم بێنە
❁ لە کێ بوویە، لە خانان
بابی بەگی دیوانان
دایکی ورچی تەلانان
❁ لەکێ بوویە لە زۆران
لە جۆ خۆر و دم بۆران
دایکی حەسڵە و باب «گۆران»
❁ دەبەرت مرم لە خەت خەتان
دایکت خاتوونێ خێوەتان
بابت مەزنێ عاشیرەتان
❁ دەیدەم بە کا «حوسێن»ی
گوارەی زێڕی بۆ بێنی
لە لا چاوی راژێنی
❁ «تازەقەڵا» و «رادانە»
مەجلیسی برادەرانە
برادەران ئیمزای کەن

کچی من چاوی جوانە
❁ کچەکەم جوانە لە دێی‌دا
کەوشی سووری لە پێدا
کوڕان دەیبەن لە جێدا
کاکی بزانێ لێی‌دەدا
❁ کێ لێی داوی بە چچان
چچەی بابێتە گۆچان
کێ پێت دەڵێ ناحەزە
پێوەی‌دا هەڵەپەزە
❁ کەرێکی پەیدا دەکەم
لێی‌دەنێم بارێک ترێ
بە قوربانی تۆی دەکەم
هەر سێک ئاغای «زندەرێ»
❁ نینی نینی نینکەڵە
هەنگوین و رۆن تێکەڵە
هەنگوین و رۆنی کاشی
دەیدەم بە کوڕی «سووورباش»ی
بۆی بگرێ قەرەواشی
❁ نایدەم بە خانی «سنە»
مەترەقەی فێری کونە
نایدەم بە خانی «بەبە»
ماڵی زۆرە و زووی دەبا

دەیدەم بە «سابلاغ»یان
داینێن لە سەر کورسییان
ببژێرێ «ئەشرەفی»یان
دەیدەم بە «ئاغا قووڵی»
بیکاتە چەپکە گوڵی
بینێ لە بانی دڵی
❁ بە کەس کەسانت نادەم
بە هەموو کەسانت نادەم
خاڵت خەزوور بێ ناتدەم
پوورت خەسوو بێ ناتدەم
ناتدەم بە کوڕە دێهاتی
دەتبا بۆ دوور ولاتی
ناتدەم بە کوڕە «سابلاغ»ی
داتدەنێ لە وەتاغی
دەتدەم بە «حەزرەت قوڵی»
بتکاتە چەپکەگوڵی
بتخاتە نێوی دڵی
لە گوڵێت کاڵتر پێنەڵی

حێبوکێ
فەقی عەولای کاولانێ

کچەگەل دەبوونە دوو دەستە، دەستیان لە پشت ملیان قایم دەکرد و بە هەڵترووشکانەوە بەرامبەر بە یەکتری دەهاتن و ئەو بەندانەیان دەکوتەوە.

«حێبوکێ» بە ملانم
خوشکی دوو برالانم
دوو برالەم پێ بێڵێ
لە سەر بەردە بێرێ
لینگان دە کچان دێڵێ
«خەجێ» چاو ئەستێرێ ❁
دەنگ دەگەڵ بلوێرێ
هێنام تازە بووکە
تازە بووکی میری
هێنام بە یەخسیری
یەخسیری قەلاتێ
دەسرۆکەی هەورینی
پێچام لە برینی
برینی گامێشێ
بەردان دەقەڵەشێ

بەردی دە بنەبانێ
بەختی «خەجە» جوانێ
«خەجێ» جوان کوژراوە
سەری لە هەش ناوە
❁ «حێبوکێ» کاکێ خۆم فەقێیە
لە دەرکی حوجرێیە
کیژان چاویان لێیە
کیژی چاو ئەستێرە
دەنگ لە سەر بلوێرە
بلوێر بەڵاڵووکە
هێنام جووتە بووکە
بووکێ حاڕەبیمە
لەسەر دارە بیمە
بە گوارە و دەرزیمە
دە دمی بابت ریمە
❁ «حێبوکێ» بە ملانم
شۆقی لە قەبرانم
بە کلچی و دەرمانم

شووبەکان

فەقی عەولای کاولانێ

کچ و کوڕ لە کاتێکدا کە دەستیان لە پشت سەریان قایم کردووە و لە سەر لاقێکی وەستاون، بە حەلوا کردنەوە بەرامبەر بە یەکتری دێن و ئەو بەندانە دەڵێنەوە.

«شووبەکان» حەسیر حەسیر
«شووبەکان» دوو کوڕە وەزیر
«شووبەکان» ماری ئاوێم
«شووبەکان» خۆت بۆ داوێم
«شووبەکان» ماری رەشم
«شووبەکان» خۆت بۆ دەکوشم
«شووبەکان» خیزم خیزم
«شووبەکان» دە دمت میزم
«شووبەکان» لەسەر لیسی
«شووبەکان» «حەمەسیس»ی
«شووبەکان» دەڵێی گوریسی
«شووبەکان» لەبێ لەبێ
کەوشی سووری تۆم لە پێ
«شووبەکان»ی ترکی

سەرم ناوە دە مڵکی
مڵکی خۆمە چەند خۆشە
تیسکی بزنان چەند ڕەشە

تەختە

زلێخا پوورئەحمەد

هەمان «حێبۆکێ»یە کە لە هەندێ ناوچەی
موکریاندا ئەو ناوەی بە سەر دا بڕاوە.

ئەی «تەختە»، «تەختە»، «تەختە»
ئێوارێکی بێ وەختە
لە سەر تەختەدارێ
خرم و هۆڕی سوارێ
سەلاّم لە بریندارێ
بریندارى خۆمە
ئاوی شیلە و شۆمە
هەڵمگرت بە ملانە
هەتا سەر قەبرانە
قەبر تەنگ و تارە
پڕ لە مشک و مارە
مشک و مار حەددێیە
کیژێ چاوی لێیە
کیژێ چاو ئەستێرە

دەنگ دەگەڵ بلوێرە
۞ بلوێر بەلالووکە
ئەسپی کاکم چووکە
هێنام جووتە بووکە
جووتە بووکی میری
ناردم بە یەخسیری
یەخسیری قەلاتێ
«ئەحمەد بەگ»م گاتێ
دوو دەسرۆکەم داتێ
دەسرۆکەی هەورینێ
پێچام لە برینێ
برینی گامێشێ
بەردان دەقەڵەشێ

هێندێک بەندی فۆلکلۆری پچڕپچڕ کە کچانی منداڵ
لە کوچە و کۆلانان دەیڵێینەوە

هەی «برنجە»، «برنجە»، «برنجە»
کەوای کاکم نارنجە
کاکم چووە ژن بێنێ
ژنی شا بە گوڵ بێنێ
ئاور بە گڕەگڕ بێنێ
مەنجەل بە کوڵەکوڵ بێنێ
کەوشی سوورم بۆ بێنێ
تارا بۆ باجی دێنێ
سەولە بۆ تاجی دێنێ
❁ هەی «چەرمە»، «چەرمە»، «چەرمە»
حەسڵی بووکێم خووشەرمە
بووکم دیت حەلاڵم دیت
لەگەڵ «وسوو لاڵ»م دیت
«وسوو لاڵی دووگردی»
دەیهێنای و دەیبردی
لە خۆی مارە دەکردی
❁ تــەق تــەق دەروازە
هاتووم بۆ نانی تازە
برا چکۆڵەم سەربازە

ئەم بەندانە لە زمان کچان و ژنانی سەردەشت،
شنۆ، بۆکان، سەقز و مەهاباد وەرگیراون.

هەناسەی ساردم هەر لێرە وێڵە
کاکۆڵت لادە جێی دەستم بێڵە
❁ فەرمانی دەستت دەگرم لە زێڕی
دەچێ سەفەرێ چاوان نەگێڕی
❁ کۆتە رەشەکەت مەیدە لە دیوار
دڵ هەر یەکێکە و مەیدە بە هەزار
❁ خۆم بە قوربانی کاکۆڵ ئاوریشم
قەولێکم پێبدە و سەد ساڵ دانیشم
❁ خۆم بە قوربانی کلکەی بەر ماڵی
ئاوری تێبەردام کاکی «کەماڵ»ی
❁ نامە دەنوسم بە پڕیشکی باران
سەر پۆستی دەکەم بە گەڵای داران
❁ بن‌دار و بن‌دار، بن‌دارە بووزە
مێردت پێ ناکەم کاکۆڵ بەکڕووزە
❁ سۆرانی سپی قاوە قاویەتی
ترخێنەی بێتام شەو پلاویەتی!
❁ دەسکی داسەکەت دەگرم لە ئاوێز
دروێنەی پێ بکەی لە «دێمی کارێز»
❁ ئاوی ئاوەنیا مۆنج ئەخواتەوە

سەوزەی قەد باریک خەو ئەیباتەوە
❁ کراس و دەرپێکەت لێ بە کەوا بێ
لەلای ئاغاکان حوکمت رەوا بێ
❁ مەڕەکەی رۆیی بنەدار و بن بی
ئاوری تێ بەردام رانک و چۆغە سپی
❁ دەسکی داسەکەت دەگرم لە لۆکە
دروێنەی پێ بکە لە جاڕە جۆکە
❁ رێگای مووچەکەت دەگرم لە باوەش
لە بۆ جوانی‌یەکەت دەبم بە چاوەش
❁ چرای ماڵەکەت سۆڵە سۆڵیەتی
پیرە بابەکەت بۆڵە بۆڵیەتی
❁ ئەگەر بمخوازی بە چەپکێ گوڵ بی
ئەگەر نەمخوازی نەمامی گڵ بی
❁ ئەم بەرم شاخە، ئەو بەرم شاخە
کراسم بۆ بکە لە گوڵی ئەو باخە
❁ یا خولا مام مەلا قەڵەمت خووسێ
چارەی نابەدڵان چەند زوو دەنووسێ
❁ قەولم پێداوی و وەمزانی پیاوی
نەمزانی لۆتی دنیای گەڕاوی
❁ تۆ بۆ من چاکی، من بۆ تۆ چاکم
تۆم خۆشتر دەوێ گەلێک لە کاکم
❁ رێگای «مەریوان» تەلاش تەلاشە

خۆم بە قوربانی ئەو پێ و کەڵاشە
❁ ڕانک و چۆغەکەت بۆری مسقاڵی
بێنە بۆت بشۆم بێ ژن و ماڵی
❁ دەسرەکەی سەرت «گوڵ پەناباتی»
خەبەرم ئەنارد، بۆ درەنگ هاتی؟
❁ ببم بە قوربان ئاتەگ کەواکەت
فەرامۆشیم دێ بە دەستە براکەت
❁ ئەورۆ جومعەیە دنیا تەعتیلە
داخوا گوڵەکەم لە کوێ ئەسیرە
❁ ڕێگای مووچەکەت بە خاکە قەندە
باڵای ئەو کوڕەی بە نوشتە بەندە
❁ سەر و فۆتەکەت دەکەم بە شانە
با لێی نەنیشێ تۆزی کارخانە
❁ سۆرانی سپی لفکە با بردوو
لە چی دەگەڕێی لە برسان مردوو؟
❁ ببی بە سۆنە بنیشی لە زەل
دەبم بە شمقارڕ دەتبرم لەگەل
❁ دارەکەی سەرکەل نەرم و حەلیمە
هێزی ئەژنۆکەم «حەمەکەریم»ە
❁ دارەکەی سەرکەل تاقە دارێکە
دوو دڵ بە هیوای تاقە یارێکە
❁ کەواکەی رەشە، رەشی مەعدەنێ

لالاییم گاتێ دەنوێ بەتەنێ
❁ باران دەبارێ دەیدا لە لیمی
بریا دەسرێک بام لە ملی «کەریم»ی
❁ باران دەبارێ دەیدا لە خیزی
بریا دەسرێک بام لە ملی «عەزیز»ی
❁ لەگەڵ مەیمونی کردم چنگ بازی
یەستا مەیمونیش پێم نەبوو رازی
❁ نووشتەی مام مەلا هەر فڕ و فێڵە
داخوا چارەنووس لە دوای کێ وێڵە
❁ هۆی کوڕی رێبوار، رێبواریت ناکەم
لە قسەت حاڵی نیم، دڵداریت ناکەم
❁ تف لە رووی پیاوی بەد خوو
کچ دارە و نایدا بەشوو
❁ سەعاتی دەستت ساختی ئەڵماسە!
سەرت هەڵێنە خودای بناسە
❁ دەبەرت مرم لاوی سەیادە
دەچیە سەفەران سمێڵت بادە
❁ سمێڵ وەنەوشەی، بەژن کەللەقەند
گەر منت نەویست بۆ پێت کردم پەند؟
❁ دەبەرت مرم لاوی هەمیشە
هەرۆ سەفەران زۆر دامەنیشە
❁ بە قوربانت بم وەستای دیواران

پەنجەرێک بکە رووبەرووی یاران
❁ دەزگیران وەرە بە دەسگیرم بی
ئەگەر نەمخوازی خوداگیرم بی
❁ یەکێک لەوماڵەی هەروا بانگ دێڵێ
ئاوێنەی پێ نێ و زولفان دادێڵێ
❁ رەشەڕیحانەی پەلک حەبیبی
من بۆ خۆم لێرەم، یار لە غەریبی
❁ بە قوربانوو بم کوڕی گەڕەکێ
چاو لە سەر هەزار، دڵ لە سەر یەکێ
❁ بریا باڵدار بام، باڵی شەش پەڕێ
جار جار دەنیشتم لە سەر مقەڕێ
❁ جادەکەی «کاژێ»م بە گوڵ دەچێنم
یارم پێیدا دێ و بۆی دەڕەنگێنم
❁ قەولم دا بە تۆ وەمزانی مەردی
نەمزانی بۆ من هەر داخ و دەردی
❁ ماشێنێک هاتۆ تەگەر مرواری
ئەگەر بۆ خۆت بێی حاشا لە دیاری
❁ چنار و لاولاو سەریان نەمامە
بۆ کێ دەگریم و کێ بە تەمامە؟
❁ سەعاتی دەستت زێڕێکی پاکە
لە ترسی خەڵکی پێت دەڵێم کاکە
❁ دەچێ سەفەرێ زۆرت پێ نەچێ

هەتا دێیەوە تاقەتم دەچێ

❁ بریا ئەمن بام لە جێی ئەو هەورە

مزلێکم گرتبا لە مقەڕە گەورە

❁ ماشێنێک هاتۆ پڕ لە هەنارە

خۆزگەم بەو کەسەی دەزگیران دارە

❁ سەعاتی دەستت نەقیم گردەروو

نە تۆ ژن بێنە و نە منیش دەکەم شوو

❁ ئەو بانە و ئەو بان عەجەب بانێکە

دۆست لێگرتنەوە عەجەب ژانێکە

❁ بەس وەرە و بچۆ بەس بکە هۆهۆ

کاکم بزانێ قەت نامدا بە تۆ

❁ بالاّم بە بالاّت بە بیوەژنی

قودۆکەت بێنە تێیکەم تووتنی

❁ کەوا و پاتۆڵ رەش خۆی لێگۆڕاوە

دەڵێن سەرهەنگە و تەڵەب کراوە

❁ خاڵی پشت برۆت تاقە خاڵێکە

رۆژێ نەتبینم پێم بەساڵێکە

❁ کەوا و پاتۆڵ سوور، سووری رۆنیاسی

بەسە تەفرەدان بۆ خودای ناناسی

❁ تاران و تەورێز ئیجاری تۆیە

وەک نێری کێوی چاوم لە کۆیە

❁ کاکۆڵ گەژ و لوول چۆن وێنەی مەرەز

ئەسپاردەی تۆم کرد سوڵتان "ئەرکیمەز"
❁ دار و پیرەدار دار هەر دارێکە
ئەو دڵەم بە تەمای کاکۆڵ دارێکە
❁ نامەی دەنووسم سەر بە تاتەوە
ئەو دەستەت دەخۆم بە سەعاتەوە
❁ کاکۆڵت بێنە بیکەم بە شانە
نەکی لێی بکەوێ تۆزی رێی «بانە»
❁ دەلینگ هەڵدەکەم دەچمە نێو قوڕێ
مێردی پێ دەکەم عالەم بدڕێ
❁ دەلینگ هەڵدەکەم دەچمە نێو ئاوێ
مێردی پێ دەکەم خەڵک بەرباوێ
❁ دەسرۆکەی دەستت ئاڵی پیوازی
خۆمن رازی نیم تۆ ژن بخوازی
❁ رێگای مەهاباد دەچێنم بە گوڵ
بەڵکوو یارەکەم لێی بکا مەنزڵ
❁ سەعاتی دەستت دینار بایییە
هات و چۆیەکەت بە خۆڕاییە
❁ بە قوربانت بم کەڵکە مراوی
رەمەزان مەگرە زەرد هەڵگەڕاوی
❁ دەسرۆکەی دەستت پڕ لە زەنگیانە
لە دوای باڵای تۆ بووم بە دێوانە
❁ پشێنی یارم بە زریزە زریزە

قەولمان بەهار بوو ئەو پایزە
❁ دەستم بە داوێن شۆفیری «خانێ»
یارم سەربازە نامەکەی کوانێ
❁ باران دەبارێ دەیدا لە شانم
خودا نەیدامێ ببم بە خانم
❁ باران دەبارێ عەرزی دەڕشێنێ
نەعلەت لەو کەسەی دڵ دەڕەنجێنێ
❁ لە «کاژێ» دەڕۆم، دەچمە گەرمێنێ
ئەو دڵە غەریبە بەجێ دەمێنێ
❁ دەسرۆکەی دەستت پڕ لە پووڵەکە
لە دوای باڵای تۆ بووم بە جوولەکە
❁ یا خولا «رەزاشا» تەختت وەرگەڕێ
یارم منداڵە و دیبا بۆ شەڕێ
❁ ماشێنێک هاتۆ لە دوور تۆز دەکا
ماشێنی یارمە و دڵ هاڵۆز دەکا
❁ سەد دارم لێدەن بە دارە تەشی
ئیشتیام هەر هەیە لە رەخت رەشی
❁ سەعاتی دەستت قورمیش نەکراوە
یەستا منداڵی و سەربازیت ماوە
❁ گەنمەکەی دەشتێم کەروێشکان دەکا
دۆستم منداڵە و دروێنان دەکا
❁ چاوم چاوەڕێی ئەو دەرک و بانە

کەی یار دێتەوە لە کوورەخانە؟
❁ ئەوە مانگ هەڵات دای لە دەلاقە
خۆ تۆ حاکم نی دەمکەی فەلاقە
❁ باران دەبارێ دانە بە دانە
دایمە چاوێکم لە رێی تارانە
❁ دەسرۆکێک دەچنم لە گوڵی بیزایە
بۆ ئارەق سڕینی رێگەی «رەزایە»
❁ کەوا و پاتۆڵت مەکینە کێشە
کاری من و تۆ کەوتۆتە کێشە
❁ رەشەڕیحانەی ماڵ لە دێبەرێ
قەولەکەت وابوو بمنێرێ سەرێ
❁ پشتێنی پشتی نۆ گەز و نیوە
خەڵک پێم دەڵێن دۆستت هەتیوە
❁ کوڕە کوردەکەی ماڵ لە نۆ هەوار
ماچێکم دەیە گات بۆ دەکەم بار
❁ خاکەکەی «کاژێ»م بە چۆڵ دەزانم
یارم رۆیشتۆ لە کێ بڕوانم
❁ وەرە بەردەرگا تۆزێک دانیشە
بەرامبەری من ئاخان هەڵکێشە
❁ چاوم چاوەڕێی ئەو رێ باریکە
کەنگێ پێیدا دێ ئەو قەد باریکە؟
❁ چاوێکم دێشێ، چاوێکم تارە

دۆستێکم گرتۆ ماڵی لە شارە
❁ کەوا و پاتۆڵ رەش بە مۆدی تازە
من مێردی ناکەم، کاکم سەربازە
❁ پێی بڵێن بە یارم دەسرەم بۆ بنێرێ
ئەی لە بۆ کفنم تەواو بۆ «مێرێ»
❁ دەسرەکەی دەستت دوو گەز کەتانە
بێنە بۆت بشۆم بەرەو جێژنانە
❁ چەندی لێ جوانە هات و چۆی قەڵا
بەرگی ئالمۆدە، دەدانی تەڵا
❁ خۆم بم بە قوربان مەچۆ مەچۆکەت
دەست هەڵتەکاندن بانی سەکۆکەت
❁ ئەو رێ باریکەی لە رێگا دەچێ
رانکوچۆغە سپی لە یارم دەچێ
❁ کەوا و پاتۆڵ رەش، پشتێن لە دۆیە
هەرکوێیەک دەچم باس باسی تۆیە
❁ کەمم پێ بگرە گوێسوانەی بانی
لەتۆ ماڵی زۆر،لە منیش جوانی
❁ لەکەل دەرکەوت ئەسپەکەی بۆرە
یان یاری خۆمە یان زەینم کۆرە
❁ کاغەز دەنووسم سەر بە مۆرەوە
غەریبی بەسە هەستە وەرەوە
❁ ئاوی ئاوەنیا، رووبی تەماتە

دڵداری ئاغا هەر یەک سەعاتە!
❁ ماشێنێک هاتۆ پێشەکەی گیایە
داوای ئاوی کرد قەنداوم دایە
❁ کەوا و پاتۆڵ رەش خەت ئەداتەوە
خۆ من سیگار نیم شەو بە لاتەوە
❁ پێی بڵێن بە نۆجوان قەت نەبێ شەیدا
لە دەسرەی دەستان کفن نابێ پەیدا
❁ هەی داد و بێداد، هۆی ئەهلی خێرێ!
رێوی راو دەکا لە جیاتی شێرێ
❁ ئەرێ هۆی جووتیار نەقیزە چنار
گاکانت لیمۆ، بۆ خۆشت هەنار
❁ تەقیلە سپی رەشتی لە دەوری
ببێ بە چوار باغ نایەمە سەیری
❁ خوا بیبرێ یاری دەمدەمی
ساڵێ جارێ دێ بۆ خاترجەمی
❁ مەنیشە بەلای نوشتەی مەلاوە
بنیشە بە لای کاری خواوە
❁ ماڵێ باری کرد، ماڵە مسکێنە
خەرجی ئەم ماڵە لە من بستێنە
❁ دەرگای ماڵتان بەگوڵە پەڵپینە
خۆ تۆ نیزام نی بۆ بەرگت شینە
❁ مزگەوتە گەورە دەنگ دەداتەوە

فەقێ بیچکۆڵە دەور دەکاتەوە
❁ ئاوی ئاوەنیا کانی‌یە بەردینە
بۆچی نامخوازی کوڕی بێ دینە؟
❁ دەسکی فەرمانت دەگرم لە مووروو
هاتووچۆی پێبکە ئاوێنەی دوو ڕوو!
❁ رانکوچۆغە سپی، پشتێن بەگرێ
سەبەب کاری مە خودا بیگرێ
❁ رانکوچۆغە سپی، پشتێن پەشمینە!
هیچ کوێت جوان نیە، خوێنت شیرینە
❁ خۆ من نەمخواردۆ کاڵەک بە خوێوە
کەوا و پاتۆڵ رەش دەمانچە پێوە!
❁ تەراکتۆرەکەت بەرز و رۆمانی
خۆم بم بە قوربان دەست و فەرمانی
❁ تازە دامناوە بناغەی مەمکم
وەرە بمخوازە هەوەڵ لای دایکم
❁ سەرزین، نەرمە زین، رکێف شیلانی
خۆزگەم بەو جێیەی تۆ لێی میوانی
❁ دەرپێ شڕو وڕ تووتڕکان بردوو
لە چی دەگەڕێی لە برسان مردوو؟
❁ بیهێنە بیبڕە لێوە کەچەکەم
ئەوە باری کرد ئاوسێی مووچەکەم
❁ هەورەکەی رەحمەت بارانی نیە

یارم گفتوگۆی جارانی نیه
❁ باران دەبارێ دەیدا لە بانی
بریا یەخە بام لە سەر ملانی
❁ بریا ئەو پەڵە هەورە بام
لە حاست ئەو ماڵە گەورە بام
❁ بەس وەرە و بچۆ بمکە تەماشا
دایکی حەوتان بم بۆت دەکەم حاشا
❁ هێندەم نەماوە بمنێن لە قەفەس
نە چاو تێر دەبێ، نە دڵ دەڵێ بەس
❁ جادەکەی «سابڵاغ» بە چاو دەکێڵم
چونکە ئەتۆی لێی بەجێی ناهێڵم
❁ ئاورت تێبەردام ئاورت تێبەربێ
سەربازی عەجەم بە ماڵت وەر بێ
❁ ڕێگاکەی «سابڵاغ» گوڵ گرتوویەتی
دڵ هەر یەکێکە و یار بردوویەتی
❁ نامەکەت گەیشت، نامەت سەر چاوم
قەسەم بەو نامە، بۆ تۆ نەماوم
❁ هەرچەند دەڕوانم هیچ کەس نابینم
هەر وەختە شێت بم دەرچم لە دینم
❁ هەی لەو دنیایە، چەند بێ وەفایە
هەتاکوو مردن خۆزگە و بریایە
❁ لە ڕێگای «پەسوێ» پەپوو دەخوێنێ

حەیران پێیدا دێ هەڵیاندەفڕێنێ
❁ تازەم زانیوە کۆتی کڕیوە
یەخەی کۆتەکەی جەرگمی بڕیوە
❁ خۆشەویستەکەم ناوم ناهێنێ
چون خەڵکی ئێستا دڵ دەڕەنجێنێ
❁ یا خوا مام مەلا هەر خۆت مەلا بی
لەگەڵ نوشتەکەت غەڕقی دەریا بی
❁ ماشێنێک هاتۆ پێش بەزەنگیانە
ئەگەر تۆم نەبێ کێم دەزگیرانە؟
❁ بریا باڵدار بام، باڵی شەش پەڕێ
جار جار دەنیشتم لەسەر مقەڕڕێ
❁ بریا باڵدار بام بە رۆژی کڕێوە
جار جار دەنیشتم لە ڕێگای «زێوە»
❁ کەوا و پانتۆڵ رەش، رەشت لێ نایە
کێ ژنی بۆخواستووی کوێرایی دایە
❁ کەواوپانتۆڵ رەش، رەشی لە بانی
تازیەداری تۆم، ناشێ نەیزانی
❁ کەوا و پانتۆڵ رەش ئاوێ دەدێرێ
پەیمانم پێی نێ، نامەی دەنێرێ
❁ کەوا و پانتۆڵ زەرد، زەردی بەهێیە
تۆبە کاریەکەم بەخاتری تۆیە
❁ دارە خڕکەڵەی شنەشنیەتی

هەتا من دەچم یار لە بنیەتی
❁ داره چکۆڵەی دەلاجێتەوە
بڵێن بە یارم زوو بگەڕێتەوە
❁ بەسم لێبگرە سەرانسوێی بانی
لێت حەرام کردم سەر ئاو و کانی
❁ وەهام تێمەگە سەر کوڵمەم گەشە
وەکوو ماسییەکە نێو زگم رەشە
❁ هەرگیز غەم مەخۆ، غەم سەوداسەرە
پاشی ئەو غەمەش خودا خێرکەرە
❁ لاقێکم ببڕن، لاقێکم پێوە
بە دواتدا وێڵم بە شار و دێوە
❁ هەی داد و بێداد گیرم خوارد لێرە
کەوتوومە نێوان مانگ و ئەستێرە
❁ چاوم چاوەڕێی وەتاغی دەرێ
کەنگێ دێتەوە کاکی «هاجەر»ێ
❁ ماڵێک باری کرد وەختی جۆزەردان
بۆ بەجێم دێڵی بۆ داخ و دەردان
❁ خودای بانی سەر بمدەی سێبووری
ئۆقرە ناگرم گوڵم لە دووری
❁ ئەگەر نەبوایە لۆمەی دنیایە
وەدوات دەکەوتم هەتا هەتایە
❁ وەنەوشەم دەچنی لە بن داری بی

هەر تۆ دەیچێژی دەردی غەریبی
❁ ئەگەر مەیلەکەت وەک جاران وا بێ
مەیلت بەر نادەم دنیاش خەرا بێ
❁ لە ژێڵڵا هاتی باڵت راوەشاند
وەک «عەلاحەزرەت» دنیات دامەزراند
❁ هەی شوانە شوانە، عازیزی ماڵێ
خۆشە بۆ تۆ بم لە شەرتی ساڵێ
❁ سەد سوارم بۆ بێ بدرێ لە رێزێ
هەر شوانەی دەکەم مەڕ لە پەرێزێ
❁ کوڕی چاک مەڕۆ، رێگاکەم دوورە
لە بۆنی خۆشت دڵم پڕنوورە
❁ نیوەشەو داهات گەییە بەیانی
کەلامەڵلات خوارد، بۆچ پەشیمانی
❁ کاکۆڵی سەری بۆخۆم دامناوە
ئێستا نەمدیوە قەولم پێداوە
❁ لاوە باریکەی بان و بان دەکا
دەشتە سەفەران جەرگم ژان دەکا
❁ بەس وەرە و بچۆ بە بەر ماڵاندا
بەس دەست بگێڕە بە رووی خاڵاندا
❁ یاخولا من بمرم ئەتۆ بمێنی
بێیە سەر قەبرم قوڕعان بخوێنی
❁ ماشێنە شینە لەوبەری چۆمی

حەزت لێ ناکەم ئامۆزای خۆمی
❁ برِیا باڵدار بام وێنەی پەروانە
بە دویدا رۆیبام تا شاری «بانە»
❁ رەشەڕیحانەی پەلکەکەی سەختە
یارم بۆی ناردووم وەمزانی رەختە
❁ سەفەری دوورت تا نیوەڕۆ بێ
خواردنەکەی ریگەت شەکر و گەزۆ بێ
❁ کەوا و پاتۆڵ رەش، پشتێن وەنەوشە
هات و چۆ بەسە لە دەرکی حەوشە
❁ سەر قەند و بن قەند، قەندی «ئێران»ێ
دۆستێکم گرتۆ لە «شار وێران»ێ
❁ ئەو دەسرە جوانەی بە دیاری پێت دام
ئێستێ پێی دەسرِم ئەشکی سەر گۆنام
❁ سەر زین، نەرمە زین، رەخت زەنگیانە
رەختت بفرۆشە جێگام زیندانە
❁ کەوا و پاتۆڵ رەش، دوگمە «عێڕاق»ی
لە نێو ئەو شارە ئەتۆم پێ تاقی
❁ سەر قەڵا مەرِۆ، بەر قەڵا جێتە
نێو سێنگ و مەمکم بە خوای سەر رێتە
❁ دەسرۆکەی دەستت پزۆکەی دەرچوو
دۆستی تازەت گرت ئەمنت لەبیر چوو
❁ سەعاتی دەستت بەندەکەی زەردە

هاتنەوەت خۆشە و چوونەوەت دەردە
❁ «کاژێ»م پێ خۆشە «کاژێ» دڵگیرە
ئەوەی لێی بڕوا حەوت ساڵ یەخسیرە
❁ هەرچەند دەڕوانم بە حوکمی دووربین
نە بۆ خۆی دیارە و نەشێوەی شیرین
❁ باران دەبارێ عەرزی دەڕشێنێ
رەحمەت لەو کەسەی دوو دڵان پێک دێنێ
❁ رێگای «شاڕوت»ێم شیشی بە شیشی
بەژنی یاری خۆم داری کشمیشی
❁ وەرە با جووت بین لە بنەی «گاگەش»ی
رەشەڕیحانە بەژنیان داپۆشی
❁ بالاًم بە بالاًت بە قەد گەنم و جۆ
خۆت ماندوو مەکە، چون نامدەن بە تۆ
❁ دەسکی داسەکەت تێیدەگرم مووروو
دروێنەی پێبکە لە زەوییە ژورووو
❁ وەرە قەول بدەین هەرکمان دوو بە دوو
نە تۆ ژن بێنە و نە من دەکەم شوو
❁ لەکەل هاتە بان ئەو کوڕە چاو جوانە
فیشەک راست و چەپ گیرفان کارخانە
❁ ماڵ لە «مەریوان»، دڵ لە «دەرویشان»
مردن خۆشترە لە ئاخ هەڵکێشان
❁ دەسرۆکەی دەستت بیست و دوو گوڵە

له جحێڵی ئێره هەر تۆم به دڵه
❁ چەند شاران گەڕام، چەند کووچه بەستم
دەرمانی دەردم نەکەوته دەستم
❁ هەر چەند دەڕوانم به حوکمی دووربین
نه بۆخۆی دیاره و نه سیرەی پۆتین
❁ هەر چەند دەڕوانم به حوکمی چراکەم
نه بۆخۆی دیاره و نه دەسته براکەم
❁ کەشکۆڵ هەڵدەگرم، دەڕۆم دێ به دێ
بەو بایه دەژیم گەر له لای تۆ دێ
❁ دەسرۆکەی دەستت تووکی کەروێشکێ
بێنه بۆت بشۆم له خۆت بێ خوشکێ
❁ سێ جار به قوڕعان، سی جوزوەی کەلام
بریا مردبام و نەڕۆیبای له لام
❁ دەسرۆکەی دەستت تووکی «حەرووس»ی
به دڵم حەز لێکرد خودا نەینووسی
❁ له گەوهەرێ و گەوهەرێ له گەوهەرێ جوانتره
له بەر تانەی بەدکاران جار جار پێت دەڵێم برا
❁ له ژێڵلا هاتی نەمزانی تۆ بووی
وەک مانگی چارده له دەوری کۆ بووی
❁ کەوا و پاتۆڵ رەش رەشی گەرمێنێ
خەبەرم بۆ هات یارم ژن دێنێ
یا غەوسولئەعزەم داینەبەزێنێ

❁ سواره باریکەی نۆکەری میران
هەر پێنج قامکەکەت قەڵەمی تیران
یان بە دۆستت بم یان بە دەزگیران
❁ دۆستێکم گرتۆ لە سونحی خۆمە
خەڵک پێم دەڵێن دۆستەکەت «دۆم»ە
لە پێش چاوی خۆم «سوڵتانی رۆم»ە
❁ دوو سوار هاتن بە لینگ‌دان
چۆغە ڕەشی بازرگان
ماندوو نەبی ئاغا گیان
❁ یا خولا مام مەلا عەمرت نەمێنێ
چارەی نابەدلان چەند زوو پێک دێنێ
لە کاری خێریش خۆ دەگنخێنێ
❁ دەسرۆکەی دەستت بۆ لای من باوێ
خەڵک بۆت دەشۆن بە فاف و ئاوێ
ئەمن بۆت دەشۆم بە گوڵ و عەتراوێ
❁ رانک و چۆغە رەش، ناوشان کشمیشی
تازەی داناوە گەلاڵەی ریشی
خودا پێت بدا لە لای دانیشی
❁ دارەکەی سەر کەل سەر ئەلەقێنێ
تازەم زانیوە یارم ژن دێنێ
بەدڵ بیخوازێ، بە شین بیهێنێ
❁ هەتیو لاچۆ مردووت مرێ

سەد کەس جانانەی دەمرێ
ئـەوەش دێـت و رادەبـرێ
❁ حەسارە گەورەی دوو دەر بە پێوە
کوڕێک لەو ماڵە و زۆرم دڵ پێوە
قفڵەکەی وەرشەو، کلیلەی زێوە
❁ یا خوا ئەسپەڕەش هەروا چوار ناڵ بی
سەر زین، نەرمە زین، پووڵەکەدار بی
یارمت بۆ کوێ برد بە کۆی زووغاڵ بی
❁ کۆترە باریکەی دندووک نەخشینە
دەچی بۆ خوارێ یارم ببینە
ئەگەر نایناسی پاتۆڵی شینە
❁ سەربازە چووکەی کۆڵ بە کۆڵەوە
ئارەق دەڕێژی لە رێی چۆڵەوە
ئەوێ جێی تۆ نێ هەستە وەرەوە
❁ سووتام و برژام لە بن ئەو دارە
بە یارم بڵێن بۆ وا نازدارە؟
ئەگەر نامخوازێ بڕوا لەو شارە
❁ بە قوربانت بم قەڵەم قاقانی
یارم دەخوێنێ بۆ خەلەبانی
کوا خودا دەیکا ببمە کابانی؟
❁ سووتام و برژام لە بن ئەو بەردە
بە یارم بڵێن بۆوا نامەردە

ئەگەر نامخوازی دەستم لێ بەردە
❁ تەشی دەڕێسم فیزە باریکان
بۆ خۆم شۆی دەدەم بە گوڵ و بە ریحان
بۆ رانک و چۆغەی تاقە دەزگیران
❁ ئەو تاقە بڵیندەی دەستم نایگاتێ
کەوا و پاتۆڵ رەش تازە دەگاتێ
بۆ خۆم پێم خۆشە بابم نامداتێ
❁ بریا کۆترێک بام لە وێنەی شانە
یەکسەر فڕیبام بۆ سەربازخانە
بەرگی سەربازی لە یارم جوانە
❁ ئاوێک دێتە خوار لە «کانێ رەشێ»
بمکەن بە بزمار بمدەن لە کەوشێ
بە دیاریم بەرن بۆ سمێڵ رەشێ
❁ باران دەبارێ دەیدا لە حەوشە
هەموویان بمرن بە کۆخە ڕەشە
بۆ من بمێنێ ئەو پاتۆڵ رەشە
❁ باران دەبارێ دانە بە دانە
بولبول دەخوێنێ سوانە بە سوانە
ئیشارە مەدە عالەم شەیتانە
❁ حەسارە گەورە دوو دەرکەی تێدا
سندووقی پۆلا عەکسی تۆی تێدا
چ لە عەکسێ بکەم خۆت لە بەندێدا

❁ رەشەڕیحانەی سەر گوێی کەنداڵی
یاری نابەدڵ گووی سەی بە حاڵی
شەوێکم رابوارد بە هەزار ساڵی
❁ دارە چکۆڵەی بەرەو غووربەتێ
دڵەکەم پڕداخە تێی‌کەن شەربەتێ
یارم منداڵە بیکەن نسحەتێ
❁ خۆم بە قوربانی لاوی سەربانی
دەست لە گوێی خەنجەر، چاو لە رێی کانی
مشوورم لێبخۆ، دنیا پێی زانی
❁ هەر خۆم قوربانت لاوی سوێی زەوی
چاو لە رێی کانی، دەسرە سرکەیی
مشوورم لێبخۆ، دنیا تێمگەیی
❁ سەر هەڵدێنم نابینم کەس
گریانم دێ زۆر بە هەوەس
بۆ گوڵەکەی «مەجروون» و بێکەس
❁ کانێ بەر ماڵان بە چنار و بێیە
پیرێکی دۆستدار حاکمی «ورمێ»یە
جحێڵی بێ دۆست سەگی کرمێیە
❁ کانێ بەر ماڵان بە چنار و گوێزە
پیرێکی دۆستدار حاکمی «تەورێز»ە
جحێڵی بێ دۆست وەک کەری دێزە
❁ گۆلی سەرچاوە خۆش و دڵگرە

تاجی و تولەکەت سالّم و سەقەرە
یان بە مالّی زۆر یان هەلّمگرە
❁ ئەی هەتیوەکەی رووت و رەجالّ
دەچی بۆ شاران بۆم مەکڕە کووتالّ
من دەدەن بەژن خۆنامدەن بە مالّ
❁ ئێوارە بەرەی مایینی ئاودەدا
بەدەستی چەپەی سمێلّ بادەدا
بە دەستی راستەی لغاو لادەدا
❁ رێگای مەزراکەت بە چریکە چریکە
گەنمێکی هێنا تازە فەریکە
یارم مندالّە تێیدا خەریکە
❁ رەشەڕیحانەی سەر سوێی دێراوێ
دەجا بکشێوە و تیرێ خۆت باوێ
ئەگەر وێمکەوێ کفنم پێ ناوێ
❁ کەوا و پاتۆلّت دەلّێی دەوارە
تو خودا دایکەنە و بیخە ئەو بوارە
ئەگەر پرسییان دەلّێم هی یارە
❁ دەسرۆکەی دەستت تافتەی پیوازی
قاوە دە دێیدا تۆ ژن بخوازی
دە مالّێت کەوێ شینی بەتازی
❁ خوا بینووسێ، قەلّەم بکا کار
کەچەلّ بۆ کەچەلّ، دملار بۆدملار

ژن بۆپیاوی پیر، کچ بۆ هەرزەکار
❁ دوو کۆتر نیشتن بە سەر قەڵاوە
یەکیان یارمە خەیاتەی خاوە
ئەوی دی براکەی چای سەر پڵاوە
❁ کوڕی چاک وەرە لە لای «نەڵێن»ێ
بەفرێک باریوە لە کاڵەبێنێ
حەیران ئاوا بوو عەمرم نەمێنێ
❁ سەد نەعلەت لە خۆم، سەتیش بێ لە تۆ
سەتیش لەو کەسەی ئەمنی دا بە تۆ
یا خوڵا باعیسکار ببێ ڕەنجەڕۆ
❁ ڕێگاکەی «پەسوێ» دەچێنم بە گوڵ
ئاوی لێدەنێم بە نیاز و بە دڵ
حەیران ڕۆیشتۆ لێیگرتۆ مەنزڵ
❁ کەوا و پانتۆڵ سپی بە بارانەوە
کتێبی عیلمی بە دەستانەوە
دینت لێستاندووم بە ئیمانەوە
❁ ئەتۆ وەرە خوار بە بیانووی ڕاوێ
ئەمنیش دێمە خوار بە بیانووی ئاوێ
دوو ماچان دەکەین لەبری سڵاوێ
❁ سەرەڕێ دەگرم بە دەلیلەوە
ئەحواڵ دەپرسم بە زەلیلەوە
تاران جێی تۆ نێ هەستە وەرەوە

❁ داره خڕیلکەی بەرەو «هەمەدان»
بەری هێناوە یاقووت و مەرجان
نەعلەت لەو کەسەی تۆی لە من رەنجان
❁ هەر چەند خەڵکی لە سەربانان
دە زگم رۆ کەن بە دەبانان
مەمدەن بە قەدر نەزانان
❁ سیگار مەکێشە لێوت رەش دەبێ
قورعان بخوێنە دەنگت خۆش دەبێ
هەر ئەمن بێنی ماڵت خۆش دەبێ
❁ یەکی زەلامی مل قەوی
بە حەوت پووت جۆ داناکەوی
قورم بەسەر دەمدەن بەوی
❁ دەچمە هەواری «مێرێ»
«زێوە»م لـێڕا دیـارە
تەماشای شاخی گولەم کەن
هەر وەکوو گامێش خوارە
❁ سوارە باریکەی دێیەکەی «خانێ»
سەرزین مەخمەری رکێف رۆمیانێ
ئەمن بۆم ناردی دوعا و سەلامێ
ئەدی نیشانە و نامەی تۆ کوانێ؟
❁ پشتێن گوڵ گوڵی خۆت و ئیمانت
ئەو کێوە دەبڕم دەبمە میوانت

نەبم بەمیوان دەبمە جیرانت
بمکە بە بۆیاغ بۆ کەوشەکانت
❁ بمنێن لە قەلات، قەلات دەڕمێنم
بمنێن لە شووشە، شووشە دەشکێنم
بمدەن بە پیران، خۆم دەخنکێنم
بمدەن بە جوانان، خۆم دەڕازێنم
❁ سەعاتی دەستت نۆ گوڵ و نۆ ریزە
خەڵکان پێم دەڵێن دۆستەکەت حیزە
خەڵکان نەزانن سەریان دا لە سەنگ
بە قسەی خەڵکی دڵمان نابێ تەنگ
❁ ماشێنێک هاتۆ پێشەکەی شینە
پاشی ماشێنێم خاسە ڕەنگینە
دوو دۆستی تێدان دۆستی نەخشینە
یەکیان «کەریم»ە و یەکیان «شەمزین»ە
❁ ماشێنە شینەی پەنجەرە خاکی
یارمی تێدایە بە خۆی و کاکی
کاکی شۆفیرە لێو پەڕە سیغار
بۆ خۆی شاگردە وەک دەنکی هەنار
❁ هەتیو لە دڵت مەگرە غەمێ
منداڵم تازە دەگەمێ
گەورە بم ماچت دەدەمێ
دەبیە خۆشەبەختی عالەمێ

❁ لەو بانە بەرزە بەنم بادەدا
یارم کەوا رەشماینی ئاودەدا
سێوێکی هاویشت داویە لە رانم
قەزای ساحەو سێو کەویٚ لە گیانم
❁ هۆی دروێنەوان، درەو نەکردوو
باخت شل و مل، مەلۆ با بردوو
دەسکی داسەکەت دەکەم لە کەتان
دروێنەی پیٚ بکە هۆی شۆخی چاوجوان
❁ ریشووی شەدەم لێک دران
دەگەڵ خاڵی گەردنی
چ قاسـیدی وام نەبوو
ئەگەر بتنێرمـە کنی
❁ دەچمە سەر بەحری خوێیە
بەرامبەر بە شنۆیە
لە هەوالان دەپرسم
میرزا چکۆڵەم لە کوێیە
❁ بە کاکم بڵێن، لە دیوەخانیٚ
بە بابم بڵێن، لە بەر هەیوانیٚ
دەمدەن بە دڵی خۆم بۆی دەچمە ماڵیٚ
نەمدەن بە دڵی خۆم بۆی دەچمە سواڵیٚ
❁ چەند شاری عەزیم گەڕام
نەمدی وەک تەوریٚز خۆش بیٚ

ئەو جحێڵی بێدۆستە
ڕەنگە پاکی ڕەشپۆش بێ
❁ ڕانک و چۆغەکەت بە زافەرانی
وەستا بم بە قوربانی
بۆی ببڕە بە فراوانی
یارم نەرم و حەلیمە
نەوەک بکوشێ نێوشانی
❁ چەند ولاتان دەگەڕام
«ترک» و «ئەڵمان» و «فەڕەنگ»
«گۆمە شینە»ی «قەرەگوێز»
داوەستا وەکوو دەهەنگ
ڕاوەستا وەکوو دارتێل
چەقیوە وەکوو غەدەنگ
❁ حەجەم نیم و عەسکەرم
فەقـیر و قەلەندەرم
دوور بێ لە سەری کاکان
قوڕی دنیای وەسەرم
ئەو خەمەت گەلێ قورسە
زۆر زەحمەتە دەربەرم

تەیری گەرمێنێ
ڕەسووڵ شیرمۆخ

سی ڕۆژەی ڕەمەزانێ
فەڕزە لە سەر ئوممەتێ
سینگت قاقەزی مەرجانێ
مەلا لێی دەدەن خەتێ
لە دنیای ڕوون بۆم نەبی
چت لێ بکەم لە قیامەتێ
❁ لە بابی خۆم دڵمەند بووم
لە خەڵکی وایە گێژم
سەدای نازدار دێ لە بن گوێم
هەر وەکوو بولبول دەوێژم
تۆ ژنی گولەکەی مێردانی
دەبێ خوێنی بڕێژم
❁ هاتەوە تەیری گەرمێنێ
هێستا دوورە و دەخوێنێ
میزدرا چۆمی «زێ»یە
گۆمێکیان دەشڵەقێنێ
سەد جار خۆزگەم بەو کەسەی
دەستت دە ملی وەردێنێ
❁ هاتەوە تەیری گەرمێنێ

بە فڕینی خاسە کەوە
سی و قورینگ و مراوی
سەرسەوزێکیان پێشڕەوە
ئەو ساڵ زستانی سەختە
وەرە جووت بین پێکەوە
❁ هاتەوە تەیری گەرمێنێ
بەویم دەڵێن مراوی
شاباڵی خۆیان لێک دا
بۆ نێوان هەور و ساوی
بە بێ سووچ و تاوان خۆم
لەسەر چیم لێ تۆراوی؟
❁ هاتەوە تەیری گەرمێنێ
بەویم دەڵێن سێلاڵە
زوو پەڕیەوە لە گەردی
زانی کوێستان خاڵ خاڵە
سەد جار خۆزگەم بەو کەسەی
دەگەڵ ئەتۆ ئاواڵە

تەیری گەرمێنێ
قالە شین

هاتەوە تەیری گەرمێنێ
هێشتا دوورە و دەخوێنێ
تیژباڵی خۆی لێکدەدان
بۆ چۆمەکەی نەڵێنێ
یاری من کچە کرمانجە
پێنسەد بەگزادەی دێنێ
دەمرم دەبەر ئەو تەیرەی
نیشانەی بەهارێم بۆ دێنێ
❁ هاتەوە تەیری گەرمێنێ
بە وی دەڵێن چوورەی ساوا
هات گەیشتە سەری «قەندیل»ی
کرێوەی کرد و گەڕاوە
دەمرم دەبەر خاڵی نازدارێ
سوارە و پیادەی رۆناوە
❁ هاتەوە، بێتەوە تەیری گەرمێنێم
بە وی دەڵێن خاسە سییە
سینگەکەت بەفری «قەندیل»ی
دەڵێی کارگی سپی‌یە
سەبارەت بە تۆ نەبێ

کارم بەو وڵاتەی چییە؟

❁ لە بابی خۆم زیز دەبووم

خەڵکی پێی وا بوو گێژم

لە بەر فکر و خەیاڵان

وەبەر ناکەوێ نوێژم

تەیری گەرمێنێ

حەمە گەردان

هاتەوە، هاتەوە تەیرەکەی لە گەرمێنێ

نیشانەی بەهارێ دێنێ

من لە بەر شابالّی دەمرم

گەر لە ئاسمانی دەخشێنێ

۞ وەک «شەم» و «شەمزین» ناکام بووم

وەک «مەجنوون» سەرگەردانم

وەک «سیامەند» جەرگم بڕا

هەر خۆم خانەوێرانم

۞ هاتەوە، هاتەوە تەیرەکەی لە گەرمێنێ

بەو تەیرەم دەڵێن چۆلەکە

ئەو دڵەم خانەی غەریبانە

دێ هێلانەی خۆی لێدەکا

۞ من بە بێ سووچ و تاوان خۆم

تۆ لەسەر چیت لە من گرتۆ قین

دوو جاران بەو چاکە چکۆلانە

بە ئاسمانەکەی حەوتەمین

هەر کەسێکی لە قەولان بازگەشت بێ

وەک جوو سەرپەنجەی ببێ شین

۞ هاتەوە، هاتەوە تەیرەکەی لە گەرمێنێ

بەو تەیرەم دەڵێن کوڕکوڕی
من لەبەر جووت شەمامەت دەمرم
هاتنە دەر کراسیان دادڕی
❁ سی رۆژەی مانگی رەمەزان
فەڕزە لە سەر ئۆممەتێ
سینگەکەت قاقەزی مەرجانە
گەر مەلا لێی دەدەن خەتێ
تۆ لە دنیای روون بۆم نەبووی
چیت لێ بکەم لە قیامەتێ
❁ هاتەوە، هاتەوە تەیرەکەی لە گەرمێنێ
بەو تەیرەم دەڵێن هەوێردە
تۆ ئەگەر مەنزوورت ژنمە
لە مستی دەنێم سێبەردە
❁ من لە یاری خۆم زیزم
لە خەڵکی وایە گێژم
هیچ برینان لە خۆم شک نابەم
بە بێ زام زووخاو دەڕێژم
❁ هاتەوە، هاتەوە تەیرەکەی لە گەرمێنێ
بەو تەیرەم دەڵێن هەوهەوە
تیژباڵی خۆی لێدەداوە
نیشت لە مەزراکەی «یەکشەوە»
باز و پۆڕ پۆلیان بەستووە

سەر سەوزێکیان پێشڕەوە
❁ دەزانم کە بۆ من نابی
وەک رۆژێ لە من عەیانە
سینگم هەموو کون‌کونە
جێگای سەرە پەیکانە
جەرگم هەمووی لەت‌لەتە
جێگای تیغی دەبانە
❁ هاتەوە، هاتەوە تەیرەکەی لە گەرمێنێ
بەو تەیرەم دەڵێن پەڕپووتە
تیژباڵی خۆی لێدەداوە
نیشت لە مەزراکەی «تەمووتە»
❁ «کاکە مەم» بۆ عیشقێ ئەسیر بوو
لە «جزیر» و «بۆتان»ێ
هەورێکی رەشی هێناوە
گرتوویە بەری ئاسمانێ
من خەمی دایک و بابم نێ
لێم بە جێماوە چاو جوانێ
❁ هاتەوە، هاتەوە تەیرەکەی لە گەرمێنێ
بەو تەیرەم دەڵێن شمقاڕی
تیژباڵی خۆی لێدەداوە
نیشت لە «قۆپی‌یەکەی باڵباڵ»ی
دە یارێ بێنە ماچت کەم

چونکە گەورە کچی ماڵی
❁ دوێنەکەم دیوە لە هەیوانێ
لانکی خڕخاڵدار رادەژێنێ
من لەبەر تای زولفت دەمرم
شارێکی وەک «سابڵاغ» دێنێ
❁ هاتەوە، هاتەوە تەیرەکەی لە گەرمێنێ
بەو تەیرەم دەڵێن پاساری
تیژباڵی خۆی لێدەداوە
نیشتەوە لە «هەیوانسار»ی
دە تۆخودا وەرە با جووت بین
شەنگە بێرییەکەی هەواری
❁ هاتەوە، هاتەوە تەیرەکەی لە گەرمێنێ
هێشتا دوورە و دەخوێنێ
من لە بەر ئەو تەیرەی دەمرم
گەر نیشانەی بەهارێ دێنێ

تەیری گەرمێنێ
عەولا گوڵناز

دەبلا بێتەوە تەیری گەرمێنێ
ئێستا دوورە و دەخوێنێ
دەمرم دەبەر ئەو تەیرەی
نیشانەی بەهارێم دێنێ
❁ دەبلا بێتەوە تەیری گەرمێنێ
ئێستا دوورە و دەقڕێ
سەر و سەر باڵی لێکدا
لەنگەری بەست لە بەحرێ
قاقەزی «شێخ فەرخ»ی پێیە
هیچ راوکەرێک نایگرێ
❁ زەینێ خۆت بدە کوێستان
ئەو ساڵ کوێستان زەنوێرە
داوێنی گوڵ دەپشکوێ
لە سەر وردە کەنێرە
❁ دەبلا بێتەوە تەیری گەرمێنێ
بەو تەیرەم دەڵێن پاساری
سەر و باڵی لێک دەدا
دەنیشت لە «قەڵای سەردار»ی
دەبەر ئەگریجەت دەمرم

شیرنە وەک قەندی شاری
❁ کێ دی ئاسمان کۆڵەکەی بێ؟
کێوی کردۆ بە لەنگەر
ئەو کچەتیوە مێردی کرد
ئەمن و تۆش خۆڵمان بەسەر
❁ خۆت لێ کردوومە خاسە کەو
هەڵۆ دەگری بە چەنگی
دیم کەوتیە بەحری بێ بن
دەرنایەی لەزاری نەهەنگی
❁ لە سەر چیت لێ گرتووم قین
بێنە سوێندان بۆ یەک بخوێن
بە ئاسمانی حەوتەمین
هەرچی لە قەولان بەرگەشت بوو
وەکوو مانێوک ببێت شین

سۆزەی کوێستان
وسێن شەشە

خۆشە سۆزەی کوێستانێ
ماڵ هاتۆتە لێنانێ
دەگەڵ گوڕەی شەماڵی
نەرمە خوناوکەی بارانێ
تاوڵ و ڕەشماڵیان هەڵدا
لە نێو شۆڕە بێژانێ
❁ خۆشە سۆزەی کوێستانێ
ماڵ دەچن بۆ هەواری
کیژ و کوڕ حازر دەبوون
لەپێش کۆچ و کۆچباری
تاوڵ و ڕەشماڵیان هەڵدا
لە نێو گوڵ و گوڵزاری
ئاونگی سەر سێوەڕە
وەکوو دانەی مرواری
❁ بۆنی سوێسنە و هەڵاڵان
دەگەڵ پەلکی شللێرێ
هەڵز و بیزا و مەندۆکێ
دەگەڵ گوڵی کەنێرێ
ئاوی بن رنوو بەفران

بنەمێرگان دەدێرێ
لە بڵیندان دێنە خوارێ
محەللی خێر و بێرێ
❁ کیژ و کوڕ لە کوێستانێ
گەینە خۆشی و مرادێ
ڕۆژێ دەچن بۆ شاخی
هەتا ئێوارە دادێ
گەر ئێواران دێنەوە
دێنن کارگ و کوڕادێ
❁ هەڵز و بیزای نیسێیان
کارگ و کوڕادەی بەرپاڵی
لە قریوەی شوان و بێریان
لە دەنگی مەڕوماڵی
پۆل بە پۆل دێنە خوارێ
بێری «برایم جەلاڵ»ی
شوان لە دوای مەڕی دەڕوا
خۆش لێدەدا شمشاڵی
❁ محەللی نێوەڕۆیان
مەڕ دێتە خوار بۆ بێرێ
شوان لە دوای مەڕی دەڕوا
خۆش لێدەدا بلوێرێ
هەرسێکیان شەنگە بێرین

«ئامین» و «ئایش» و «مێرێ»
کیژ و کوڕ بە سۆرانیان
لێکرا دەکەن هاوێرێ
❁ «ئایش» دەڵی: هۆ «فاتم»!
«فاتم» دەڵێ: «ئامین»ێ!
تووڕ و شیرمەشکان ساز کەن
با بچین بۆ مەڕ دۆشینێ
مەڕ نایەتەوە ماڵێ
ئەوەڵ مانگی هاوینێ
❁ ئەو کوێستانە دەیبینی
هێند سوورە دەڵێی بووکە
هەر لاخڕێکی دەیبینی
پڕ لە خونچە و گوڵووکە
جێگای بە ویسحەت کوێیە
«مەیدانچۆغە» و «بەردووکە»
لە بن سێبەری بییان
ئاوی زۆر سارد و سووکە

گەوهەرێ
قاله شین

نیزام نیزام پەیدا بۆ
خۆزگەم بەوانەی پیرن
بە سەربازیان نووسیوم
دەمبەن بۆ «قەسری شیرن»
خۆزگەم بەو جحێڵانەی
دەستیان لە مەمکان گیرن
❁ «گەوهەرێ»! ئەی «گەوهەرێ»!
گەوهەرەکەم بەرەو ژوور
دەستم برد بۆ بەرۆکێی
هێنام لیمۆی زەرد و سوور
دڵی یارێم نەرم کەی
«موسا» لە سەر کێوی «توور»
❁ قاچاخچی لە گەرمێنێ
کراسی «مارۆ»ت بۆ دێنێ
دەبەر قاچاخچیان مرم
دڵی یارم ناشکێنێ
❁ دوێنێم دی لە رێی کانی
دەستم برد بۆ مەمکانی
دەیکوت: هەتیو بە دڵی تۆم

چون عاشق و ماڵ وێرانی
❁ «گەوهەر»ێ! ئەی «گەوهەر»ێ!
چ ناهێنێ کار و بار
رەبی مێردە گولەت مرێ
پەنام بە «غەوس»ی نازدار
❁ لەبەر ئەو بەژنەت دەمرم
دەڵێی چووزە قامیشە
قەبری مردووی مۆری من
جەرگت هێنام لە ریشە
هەموو عالەم دەزانێ
جێی گوڵان«وەتەمیش»ە
ئەو مێردەت وەک جووی «قودس»ە
قەت لە کنی دامەنیشە
❁ دەوای دەردی من جوانێ
سینگ تۆڵە گەزۆی «بانێ»
ئاگادارت ناسک بێ
چاکی زینوێ «خەلان»ێ
لە شەوڕاوێ تەڕدەستە
وەک «حەمە تاڵی بانێ»
ماڵە کابرات خرابێ
وەک کاولی «غەلیفان»ێ
❁ «گەوهەر»ێ! ئەی «گەوهەر»ێ!

«گەوهەر»ێ «کانێ سیران»
سینگت کەشفی زیڕە
خاسەڕەنگە بۆ تیران
❁ یا «چاکی گوێنیان» هاوار؛
لە زینوێی «ئەمین ئابات»ێ
لە سوێی ماچێکت مردم
بووی بە ئاوی حەیاتێ
موژتەهیدی «کەربەلا»م
بە پێخواسی ناگاتێ
خۆشە دەگەڵ بای ناسک
لە سەر «پردی سیڕات»ێ
❁ ئەی «پیرە محەممەد» هاوار!
چاکی تیراوێ داری
یا پیرم «وێنس» هاوار
بەرەوڕووی «چواردیوار»ی
با لەسەر وی لە دارمدەن
هەروەک سیتوان «بەهاری»
حەیفێ خەساری کردووی
ئاشقی کرژ و کیفاری
❁ لە خەیابانی شاری
لە کووچان، رێمکە رێمکە
دینت دەگێم «پەهلەوی»

دەڵێ شەپکەی لە سەرکە
لە ترسی شەپکەی هەڵدێم
دەڕۆم دەچمە گەرمێنێ
ئێستا ئەوێم باشترە
پاشای «رۆم» دەمخنکێنێ
❁ «گەوهەر»ێ! وەی «گەوهەر»ێ!
گەوهەرەکەم شکاوە
تیری «ئامین» چاو جوانێ
راست و چەپ لـێمدراوە
❁ دڵم یەکە و غەمم دوو
لەت لەت لە جەرگم هەڵبوو
بوومە کێردی تازە سوو
یەکسەر هەوام لێ بڵیند بوو
لەسەر دوو تاقە ماچان
هەر پێنج فەڕزی نوێژم چوو
❁ سەقری بەهەشت یاقووتە
جەهەندەم ئاوری رەشە
ئەگەر تۆ یاری منی
لە گولەکەت بکە حاشا
ئەگەر دادم نەپرسی
دەچمە دادی «رەزاشا»
❁ «گەوهەر»ێ! ئەی «گەوهەر»ێ!

چ ناهێنێ کار بە زۆر
رەبی مێردە گولەت مرێ
پەنام بۆ «ئەحمەدی کۆر»
❁ ئەو زنجیر ناعەداڵەی
ئەو کافرە رایکێشاوە
لاڵ بم بۆ حێلی کوردی
مەشموولی لێ گیراوە
ئەو جحێڵی چاردەیە
هەمووی مەشموول نووسراوە
پیرێکی کۆنەساڵە
لە دوایە بەجێ ماوە
❁ شەرت بێ لەداخت دەڕۆم
تا کوو دەچمە «لۆڕستان»
بە مەسکەنم نەزانن
لە گەرمێن هەتا کوێستان
تۆ ببە «فەڕوخلەقا»
ئەمنیش دەبمە «ئەرسەلان»
❁ «گەوهەر»ێ! ئەی «گەوهەر»ێ!
تانەم لێمەدە دەمرم
چیدیم تانە لێمەدە
بەرگەی تەشەر ناگرم
❁ قاچاخچی لە گەرمێنێ

کراسی «مارۆ»ت بۆ دێنێ
بەر نیسێم لێ حەرامە
با بسووتێم لەبەر تاوێ
❁ چەند شاری عەزیم گەڕام
دەگەڵ چۆمی «مەجیدخان»
جوانێکی وەک تۆم نەدی
مەگەر حۆری دە عاسمان
❁ بێنە دەچۆمیم باوێ
بۆ پردەباز زۆر چاکم
یا مێردی بکە بە خۆم
یا مێردی بکە بە کاکم
ئەگەر بێت و رازی بی
ئەوا من خۆڵی پاتم
مەولوودێ لەسەر شانم
ببی بە بووکی دایکم
❁ «سارا» مەچۆ پاراوێ
رەش دەبی لەبەر تاوێ
تەختی «هیتلێر»یم دەنێ
بە بی لێوئاڵم ناوێ
ئاوی دەستی «کەژاڵ»ێ
دەردی پیاو دەپەرێنێ
❁ وەکوو سەری کوێستانان

دایمە سەرم بە تەمە
بارگەکەت بۆ کوێ لێکنا
بەقەد دنیایەم غەمە
هەروەک قەشەی هەرمەنیان
بە زاوای دەگرم شەمە
ئەو بارگەت بۆ کوێ لێکنا
سەڵا، قەت کەسم نەما
❁ خۆ من دڵم سفرە نیٚ
لە هەموو جێیان رایخەم
ئەگەر تۆ یاری منی
توخودا بمکە خاترجەم
❁ وەکوو کوێستانی «بێستوون»
دایمە سەرم بە تەمە
هیچ ناوێرم بیدوێنم
دەڵێی«پاپی ئەعزەم»ە
بە بێ باڵات ناسک گیان
ئێرەم پێ جەهەندەمە
❁ لە بەر بەشی خودای مرم
چۆن منی کردۆ بە گا دا
بۆ خۆی وا لە عەیشێ دا
بەمنی دەکێشێ جەفا
خۆی لێکردوومە«مێرێ»

منى كردووه بە «وەفا»
دەشتى دەوژێڕی

قاله شین

دەشتی «دەوژێڕ»ی، هێلان بە هێلان
سینگی نازدارێ حەوزی سمێلان
خۆزگەم بەو لاوەی لێی دەبڕێ فێلان
❁ کاولی «دەوژێڕ»ی،هەڵبردن مەڕە
سینگی نازدارێم پەنیری تەڕە
خۆزگەم بەو لاوەی لە سەر تۆی شەڕە
❁ دەشتی «دەوژێر»ی کاریتەی مێوە
فەرزندەی خەڵکی زۆرم دڵ پێوە
بمگرە بە نۆکەر بۆو جووتە سێوە
❁ بۆڕی‌یەکیان لێدا لە سەر «نۆبار»ێ
کراسی نازدارێ لە خمی «حەمبار»ێ
تووشی بێریان بووم دوێنێ ئێوارێ
❁ دەشتی «دەوژێڕی»م، کاکی بە کاکی
یارمی لێ دەرچێ، خرابێ خاکی

روبابه
قاله شین

چ دەبوو هەموو دەمان
دوو بە دوو لێدەین قەدەمان
مەمکە شەریک بۆ غەمان
ئەشهەدوو «روبابە» جوانە
شانسی کورد و عەجەمان
❁ بۆت دەڵێم گەڵا گەڵا
«غەڵیفان» و «قۆیتەڵ»ە
«دۆڵپەمۆ»یە و «مازەڵە»
«کێچاوا» و «گابازەڵە»
لووس و عانە و مەنگەڵە
ترکی و کوردیم تێکەڵە
سەرەجە و دەرد و بەڵا
لە سەر پیسەی وەخرٍ بێ
لێکرٍا دەڵێین ئیشەڵڵا
دەبێ دەستم زیارەت کەن
چونکین فێرە باغەڵە
❁ «زەنبیل»ە و «گەردیگلان»ە
«کۆکە»یە و «دەروێشان»ە
«شاگێلدی» و «لاسەگوڵان»ە

«گراوێ» نێ، «گلێنان»ه
«قۆیتەڵ» نێ، «غەڵیفان»ه
«ئامێد» دەگەڵ «ئافان»ه
«قۆزلوێ» و «قۆزلوان»ه
«زیندووقۆڵ» نێ، «گامێشان»ه
«کاوڵان» نێ، «کووران»ه
«سارکێ»یە و «زمزیران»ه
ناوەڵلا «دەشتێ پان»ه
«دۆڵەتوێ» و «پاراستان»ه
«سێونە»یە و «زەرگەتان»ه
«قۆڵتە» نێ، «شیوەشان»ه
«سۆستان» و «ئاڵوەتان»ه
«بێکۆسە» و «گرشەیتان»ه
«هەنگەوێ» نێ، «شەختان»ه
«شەکراوێ» و «مام هەیبان»ه
«باستام بەگ» نێ، «بازرگان»ه
«شارستێن» و «حوجران»ه
«گاگەش» و «کیسەڵان»ه
«بێهەنگوێن» و «بۆدوان»ه
«سەرتان» دەگەڵ «مەڕانە»
«زێوە» و «حاجیمامیان»ه
«بەیتاس» و «گیادروان»ه

«وزندەرێ» و «قەرەچەلان»ە
«کولیجە» نێ، «دەرمان»ە
«قەمتەرە» نێ، «برهان»ە
«سەدراباد» نێ، «ئاشی گوڵان»ە
ئەوچەل نۆرەی شارانە!
«تازەقەڵا» و «بۆکان»ە
«تەوریز» دەگەڵ «تاران»ە
«زەنگان» نێ، «هەمەدان»ە
«سەقز» نێ، «مەریوان»ە
«سابڵاغ» و «شنۆ» و «بانە»
ئەو وڵاتانە پاک گەڕام
هەر «رووبابە»م پێجوانە
۞ بە حوکمی شای «حرووس»ی
یەک پارچەم کاغەز نووسی
دەینێرم بۆ «رووبابە»ی
لە «رادانە»ی «سندووس»ی
۞ «محاڵ»ی کوولەکە خۆر
«شارویران»ی وشتر زۆر
لەو «گەورک»ی هەرزن خۆر
لەو «مەنگوڕ»ی کەشک خۆر
لە «مامەش»ی رەش و بۆر
«لێڕەوار»ی پەستەک بۆر

خۆ «مەلا مستەفا» نیم
لە گولەت بستێنم بە زۆر
دەبەر ئەو کەللەت دەمرم
لێی دەبەستی شەدەی مۆر
❁ بۆت مردم بەڵێ «روبابە»
بە دم و ددانی وردی
هەروەک قەندی «میاندواو»ێ
نەرمی و سپی و جێوەردی
خوا لە مەلای خۆش نەبێ
بۆ بە سیغەی مارە کردی؟
چووم «روبابە»م گێڕاوە
بۆ سەر مەزهەبی کوردی
❁ هاتە خوارێ لە کێوی
تۆ زێڕی یا نە زێوی؟
وە گولەی دەخەم شەپڕێوی
دەیدمێ دەرمان رێوی
جا ئەگەر ژیا، ئەگەر نەژیا
بە قەبری بابی خێوی
لە گۆڕی بابی گولەی بەم
حەپسی کردووی لە کێوی
بۆ حاڵی من و تۆ دەگرین
کەروێشک و گورگ و رێوی

❁ ده وەره وەره «روبابە»
گەردن شوشەی شەڕابە
چەند بە مەکر و دۆڵابە
سەر زارەکی تۆ چلۆنی
بە دڵ دەگەڵم وا بە
ئەگەر وەک من نەسووتابی
سەراوبن بە قوڕێم دابە
❁ چەند عەیش و نۆش و دەماغ
دووڕ و لەعل و شەو چراغ
یارم وەک ماینێ چەڵاغ
سینگەکەت کاغەز پەرداغ
«کەپەکەند» و «قەرەبڵاغ»
«حاجیخۆش» و «قیلیانتاغ»
«گابازڵە» و «قەرەداغ»
«بەردەمێش» و «خاتون باغ»
«داربەسەر» و «پاشبڵاغ»
«سەهەند» و «ماینبڵاغ»
«شنۆ» و «سەردشت» و «سابڵاغ»
وجاغدار و بێ وجاغ
بۆو «روبابە»ی گەردن زەرد
لێکرا هەمووی دەڵێن ئاخ!
ئەشەدوو «روبابە» جوانە

ئەو کیژەی «قەرەپەپاغ»
❁ بۆت مردم بەڵێ «روبابە»
بە دم و ددانی وردی
ئەگەر هاتی و رابردی
سیلەی چاوم لێ کردی
چەند کافر بووی نەمردی!
خوا لە مەلای خۆش نەبێ
چۆن بە سیغەی مارە کردی
چووم «روبابە»م گێڕاوە
بۆ سەر مەزهەبی کوردی

هەی نازدار
قالە شین

چاوت ئەستێرەی شوانان
هەڵدێ بەری بەیانان
شۆقی‌دا لە کۆڵانان
قوونەبانی ژن جوانان
بە شانم‌دا دێتە خوار
ئاوە چۆڕەی گوێسوانان
لە سەر باڵات ناسک گیان
با لێمدەن بە دەبانان
۞ دەوای دەردی من نازدار
قەد بارێکی شەدە لار
دەبەر ئەو سینگەت دەمرم
بۆت بە کوێستانی سازگار
لە سەر چاوی جوانی تۆ
دەکەم تۆبە و ئیستیغفار
۞ باز و شەهێن و تەڕلان
لە سەری بگرن سەیران
لێرەڕا تا «تاران»ێ
لێی دەدەم بە خەیابان
قەدەمیان تێدا لێدن

گەورە گەورەی ئاغایان
یا بە کەژاوەت دێنم
یا بە تەیارەی «ئەلمان»
ئەگەر بەوەی بۆم نەیەی
دێنم سوارەی «مەنگوڕ»ان
شەقەت لە کوڵمەی دێنم
تەرزی دەمانچەی «نێرگان»
❁ هەوەڵ مانگی «سەفەر»ێ
سێزدەی «سێزدەبەدەر»ێ
دوازدە لە «شەهریوەر»ێ
بیست و یەک لە «ئازەر»ێ
هەر هێندەی کوتم جوانە
خەریک بوو ئابڕووم بەرێ
گەر بێت و لەگەڵم بێی
یەکسەر دەچمە «پشدەر»ێ
گەواد تەڵاقی نەدای
لێی گەڕێ چاوی دەرێ
کارێ بۆ مە راست دەکا
ئەو شەخسەی «دۆزەغدەر»ێ
❁ روونی دەڵێی دووربینی
لووسی وەک جەلاتینی
وەک گوڵی بێ پەرژینی

ئەوەندە خواستەم هەیە
خۆشی لە گولەی نەبینی
«نەڵێن»ت دەسەر گێڕم
تا ئاشی «کەندە شین»ی
یەکسەر بە قوربانت بێ
دوومانگای «قالە شین»ی
❁ هەی نازدار، عەمرم نازدار
ناسکۆڵەی نازەنینم
حاڵی بووی لە لەرزینم
پاڵێکم وەپاڵی دە
یاری گران و سەنگینم
حەوت ساڵان پێش تۆ بمرم
یاڕەبی مەرگت نەبینم
❁ «دێ مەلا»یە و «دێمە سوور»
کل و ئاوێنە و کلتوور
لەسەر رانی داناوە
چاوان دەڕژێ بە دەستوور
یەکسەر بە قوربانت بێ
«ورمێ» و «خۆ» و «شاپوور»
ئەگەر ئەوەت پێکەمە
«قۆیتەڵ»ت دەسەر گێڕم
با دەگەڵ بێ «شارەزوور»

رەبی لە گولەی نەبووریٚ
«مووسا» لەسەر کێوی «توور»
❁ سەماوەرێکی هەشتی
دەگەڵ دەستێک ئیستیکان
دووکانێکی چکۆڵەت بیٚ
دابنیشی لە شارستان
سیٚ مسقاڵت چا هەبیٚ
دەگەڵ دوو درەمە قەندان
دەبیٚ لە مە میوان بن
سەد رەیس و سەرگوربان
هیچ پەکم پیٚ ناکەویٚ
تۆم کابان بی ناسک گیان
خۆشە پێکەوە بکوڵێین
وەک لەپەی «بەری مێرگان»

دەرزی‌یە
قالە شین
بریندارم مەمبزێوە
ماچت دەکەم لەڕێوە
دایکی بە خێوی کردۆ
کوا هێندی منی دڵ پێوە؟
ئەگەر «کەژاڵ» لێم زیز بێ
تا ملان دەچم دە قوڕێوە!
❁ دەرزی‌یە،ئەمان دەرزی‌یە
کاکە گیان، بە منیش دەرزی‌یە
ئای «خەزاڵ»ێ «دۆڵە شێخان»
یار شلە «کادەروێشی»یە
ئەو کچەی ئاغای «شۆریجە»ی
قەت مەحبووبەی وا نیە
❁ماڵێ بابم سوورەگوڵ
توخوڵا دڵ مەدە بە دڵ
بەژنت ریحانەی شەتڵ
بۆنت وەکوو قەنەفڵ
یار ددان سەدەفی حەسڵ
مەمکت وەک شەمامەی بڵ
زارت پشکووت وەکوو گوڵ
ساڵێ جارێک بتبینم

مەقسوودم دەبێ حاسڵ

❁ پێ لەو پردەی دامەنێ

ئاڵووداری رزیوە

کراسەکەی مانتۆی کەسکە

لەسەر سینگی خزیوە

موددەتێ لە عومری خۆم

جوانێکی وام نەدیوە

قەبری مردووی مۆری من

بەفرە بە بای باریوە

❁ چ بوو چم لێقەوماوە؟

سیم سەرم لێشێواوە

خۆش بوو حەپسی ئەبەد بم

لەسەر ئەو جووتە چاوە

لێرەم ماچێک لێدەستاند

«نەڵێن» دەنگی دەداوە

قەرە خرچەی نێو «مەنگوڕان»

ترش و شیرن و پڕئاوە

❁ دەرزی‌یە،وەڵڵا دەرزی‌یە

کاکە گیان، بە منیش دەرزی‌یە

ئەو کچەی ئاغای «قۆیتەڵ»ێ

قەت جوانێکی وا نیە

لای داوە لە من
مام عەلی سەقزی

قەیسی نێو قەرەڵووان
بادامی نێو سنجووان
سێوی نێو دارە تووان
سێتیرێ نێو بڕنووان
لێرەتڕا بە قوربان بێ
تا زینوێ «بارام لووان»
لەسەر چاوی بازی تۆ
پێنج فەرزەی نویژێم چووان
«لای داوە لە من، دەی دەی، لای داوە لە من»
❁ دەبەر ئەو گەرنەی دەمرم
شلکە، نەرمە وەک فەنەر
یا «شابازی قەلەندەر»
لە هەناسەی من سووتا
«مەرگە» و «بیتوێن» و «پژدەر»
ئەگەر کاکت دەنگێ بکا
لەبەر عۆدەت دێمە دەر
یا خوا لێت مبارەک بێ
«زەڕی» و «نایلۆن» و «مەخمەر»
❁ ریحانەی گوێی کەنداڵی

تەماشای خەت و خاڵی
«لەیلێ» هەر وەکوو تۆ بوو
«مەجنوون» لە دوای دەناڵی
پیاو ناوێری بیدوێنێ
لەبەر زیڕەی منداڵی
❁ خۆزگەم بە گوڵ و گوارە کا
شەو تا رۆژ بوو لە گەردن
خەمناکی چەند ناخۆشە
سەد خۆزگەم کا بە مردن
❁ لە «لاجان»ێ «بەرکەمران»
لە «شنۆ»یە «حەسەن نووران»
بە سەر شانمدا هاتی
تەرزی بەڵای ناگەهان
کەڕ بم، لاڵ بم لە تاو تۆ
دەتبەن بۆ بژاری بێستان
جا چۆن ئەمن کوێر نەبم
تۆ دڕووت دەدرێ لە دەستان
بە قوربانی تۆی دەکەم
سەت پیرێژنی بێددان
❁ بەو خودایەی بێ مەکانە
ئەو دڵەم بەحری غەمانە
بۆ دەستی دەکرم بازنە

بۆ ملی دێنم زەنگیانە
لە دێیەکی سەدماڵی
هەر تەسکەڵێم پێ جوانە
ئەشهەدوو ماڵم قەبرە
کوڵمەی فەندی ماچانە
❁ بەند لە سەر بەند وەستاوە
دەنکێ نەشەم نەماوە
دەک کوێر بم لە چاوانم
بە چاوانی گریاوە
دەستم لە ملی کە مردم
هێز و تینم نەماوە
قوڵکی بەری گەردنی
حەوز و کانی و گۆلاوە
هێندە توونی و دەم ویشکم
پێنسەت قومم لێداوە
بێنە سوێندێکت بۆ بخۆم
توونیەتیم لێی نەشکاوە
❁ بۆی دەڵێم تۆزە تۆزە
هەوری لە ملان هاڵۆزە
لەبەر دایکی ناوێرم
لێی بکەم جێژنەپیرۆزە
یارم کەمێ منداڵە

لاڵ بم ناتوانیٚ گۆزە
ئەو حەیفە ئەمن دەگوژیٚ
دایان بەو کوڕە بۆزە
❁ ئاوی «کانیە بەردووکە»
لەبار و قوڵەکە و چووکە
مەعلووم ماچێکم داتیٚ
زیارەتە و تەبەڕووکە
چاوم بە باڵات کەوتۆ
شێت بووم بە بیٚ جندووکە
❁ سینگت تەختە بۆ لاوان
قورینگیٚ سەر کانی و ئاوان
وەختە بمرم لە تاوان
کورتیٚ نازداری باوان
دەبەر ئەو سینگەت دەمرم
بۆتە هەسانی «ساوان»
❁ گشتی لێدە، زۆر خاوە
قورینگی دامێن بە خوناوە
دەبەر ئەو بەژنەت دەمرم
دەڵێی خەیاتەی خاوە
بەینێکی یاری من بوو
قەولی بە چەندان داوە
❁ شیرنی دەڵێی قەنداوی

مانگی هەڵدێی لە ساوی
سفتە و لووس و لەباری
وەستا لە ڕەندەی داوی

ئەی لە پیرێژن
قالە شین

ئەی لە پیرێژن چەند مەکربازە
کۆنەی دەفرۆشێ بە نرخی تازە
❁ خۆ من هەرا نیم بڕۆم بە گوێدا
با بێمە خوارێ بە زولفی تۆدا
❁ رەبی پیرێژن بە رۆژێک بمری بەفر و باران بێ
قەبرهەڵقەنت کەری گاڕان بێ
یاسین خوێنەکەت ورچێکی لەڕ بێ
بەردی ئەلحەدت تەپاڵەی تەڕ بێ
لە رۆژی قیامەت هەر ئاخرت شەڕ بێ
❁ هەی داد و بێداد لەو بێ دەلیلی
شەو نێ نەبینم خەونی زەلیلی
چارەم ناکرێ نەچمە «زەمبیل»ی
❁ هەی جەنگە جەنگە، مەلاژن جەنگە
شانم لێمەدە، کۆڵانم تەنگە
❁ هەر شەو دەنووستم بە تاسەی تۆوە
بۆن دەنێم بە بۆن هەناسەی تۆوە

کاروانە

قالە شین

کاروانە هەی کاروانە
کاروانە لە بنەی چاکی
حەمری من کەسی کاکی
بۆوا ماندوو و هیلاکی
دۆست گرتن بۆیە خۆشە
بۆ وەرِەزی و خەمناکی
❁ کاروانە هەی کاروانە
کاروان بۆ تۆ نەمێنم
«تاران» و «تەورێز» دەکەم
کراسی «کرێم»ت بۆ دێنم
نۆ لانکەت بێ ناسک گیان
یەکسەر بۆت رادەژێنم
دێم و کوڵمەت ماچ دەکەم
سوێندەکە نایهێشێنم
❁ تۆ بەفری، من قەندیلم
تۆ خەونی، من دەلیلم
تۆ مەلای، من مەندیلم
تۆ کوێخای، من سجیلم
وەک میرزای لێت قابیلم

ئەو ساڵ دوو ساڵی تەختە
کیژێ بۆ تۆ زەلیلم
❁ کاروانە هەی کاروانە
کاروان هاتۆ لە دۆڵێ
کیژ دەفرۆشێ مەمکۆڵێ
کوڕ لێی دەکڕێ بە کۆڵێ
ماڵی دنیام نەماوە
چم نێ بیدەم لە تۆڵێ
❁ بازم کەوتمە سەر ڕەوێ
تۆ لە کوێی، بۆت دێمە وێ
نۆسەت بۆمبی ئەتۆمی
وە گولەکەی مێردت کەوێ
❁ بە سەیدی «سەفا خانە»
دنیا دەوران دەورانە
دمت هەنگوینی شانە
ملکی «تەویلە » و «میانە»
«سەوڵیتەپە» و «گۆڕخانە»
دڵ عەمباری بەندانە
ئەگەر شێرەی لێبەردەم
دێ وەک تەرزە و بارانە
ئەو ژنە ریخێ دەڕێژێ
کەسری شانی کوردانە

❁ خۆشە دەو دنیایەدا
حاسڵ ببێ مرادم
هیچ دەربەست بە قیامەت نیم
لەوێ عەینە ئازادم
❁ «قەڵا» و «خوڕگە» و «خوێڕیاوا»
«بۆکان» دەگەڵ «میراوا»
«سەرا» دەگەڵ «سەرچاوە»
«خانان» و «جبریلئاوا»
لە ڕێی ماچێکم داوە
چۆن دەفتەرم خوێندوە
هێندەی دیم لەسەر ماوە
حەیرانی گەردن زەردم
سۆفی جاشک لێیداوە
❁ ئەمن «ڕەسووڵ»ە شێت نیم
کاسپێکەم ببێ بە سواڵ
ئەگە هاتمەوە ماڵێ
با دەورەم بگرن منداڵ
دەورەیان دابووم منداڵ
دینم لێبوو ترش و تاڵ
گەنمم نێ بیکەم دە چاڵ
سۆفی نیم، بۆچمە بەرماڵ؟
بەڕەم نێ، بۆچمە هەرزاڵ؟

ژنم نیّ، نامهەویّ ماڵ
رۆژیّ سەد ماچان دەکەم
بیّ پووڵ و دەستی بەتاڵ
گریانم بەو حاڵەی دیّ
شەویّ دەنویّ بیّئاواڵ
❁ گەرنت رادیۆ و بڵینگۆ
لە گەرمیّنیّ زەرد بوو جۆ
لە دەروونم دیّ بۆسۆ
مەلا بە مەندیلی تۆ
سۆفی بە زەنبیلی تۆ
فڕیّم دەن لە کۆڵانان
ملکەچ و دەستەوئەژنۆ
ئەو زنجیرەی دە ملمدا
ئەو خەلیلەم لە ئەستۆ
هەمووی بۆ من خەڵاتن
سەبارەت بە چاوی تۆ
❁ کاروانە هەی کاروانە
کاروان هاتووە لەئاوان
سینگت هەسانی «ساوان»
مراوی لە دەم گۆلاوان
داوام لیّ کرد بۆ ماچیّک
بۆچت نەکووت بە چاوان؟

❁ دەردت لە ماڵم «شەرمین»
لێت بڕیوم هێزوتین
بە قوڕعانێ سەر پەڕشین
سوێند بە «محەممەدی ئەمین»
ئەو سینگەت «کاغەز کۆپین»
بە شەرت دەردی ئەجل بێ
هەر دووکمان لێکڕا بمرین
ئێستا ئەمن چاترم
لە کوڕی کابرای ردێن شین
دەوەرە دەستم دەستۆی کە
تۆ «سوڵتان عەلائەددین»

هەوارە
قالە شین

ئەوڕۆ دڵم غمناکە
خۆشە دەنگی بلوێری
مامزی دەشتی «خۆشناو»ان
قورینگی گەرمەسێری
بۆخۆم دەبم بە سەر شوان
ناسکێ دەگرم بە بێری
تاوڵێکت بۆ هەڵدەدەم
لە بنەی «بادینە کوێر»ی
«هەوارە گیان، هەوارە
هەوارەی سەر و ماڵم
«کەژاڵ» لە دۆستم دەرچی
خۆشە ببیە حەلاڵم»
❁ دەوای دەردەکەم «مرێم»
تۆ ڕێبواری، ئەمنیش ڕێم
تۆ سەنیری، ئەمن جێم
ئەتۆ کانی، ئەمن دێم
پیاو مەنێرە بۆ خۆم دێم
❁ دوورە دەنگم نایگاتێ
کەس نێ ولامی دەمێ

سەبر و هۆشت لێ بڕیوم
کەوتوومە بەحری غەمێ
سووچی چادرەکەت لادە
مانگ دێتەدەر لە تەمێ
دایکی دەڵێ: پێشکەش بێ
بابی دەڵێ ناتدەمێ
سەری کوڵمەت ماچ دەکەم
یەکسەر بۆ جەهەندەمێ
❁ با دڵم بتۆقێ لە تاوان
بچی نێو هەور و ساوان
با ژنم وەگیرنەکەوێ
لە «سەهەند» و «سۆلاوان»
ئەمن داسی دوونانی
ئەتۆش هەسانی «ساوان»
داوام لێکرد بۆ ماچێ
بۆچت نەکوت بە چاوان؟
کانێ نێو دێی ناخۆشە
بۆم وەرە کانێ پیاوان
❁ پیر و کەوت و ڕەوت و خۆم
بۆ ماچێکت ڕەنجەڕۆم
ساز بە ڕەگەڵمکەوە
هەڵتدەگرم و دەڕۆم

سینگ تۆڵە گەزۆیە
شەوێ لایەکی دەخۆم
هەوارە بڵێ هەوارە
هەڵیاندا لە «بێخێری»
سەر دەکەمە سەر رانت
بمشێلە ناسکە بێری
❁ گەردالێک بەفر باری
دایگرتۆ باڵەخانە
لەسەر سینگت جووتێک سێو
هەر دوو قامکیان نێوانە
بە حوکمی خودای لەسەر
بۆ دەردی من دەرمانە

کاڵیلیێ وەی رابیلیێ
قالە شین

«کاڵیلیێ»! وەی «رابیلیێ»!
دە وەرە دەردت لێم کەویێ
نەخۆش و دەردەدارم
لە جێیدا کەوتووم شەویێ
لەمن و لە گولەی مێردت
کاممانت زۆر خۆش دەویێ؟
❁ تۆ ئاغا بی، من مسکێن
چەندەت لێ جوانە پشتێن
لەو پەشمینەی جوانترە
ئەگەر بۆی دێ لە گەرمێن
با لە سەر دڵخواز بیکەین
قومار و تەخت و نەردێن
دوو ماچم لێ بردەوە
بە گرێوی چۆڵەمەشکێن
رەببی وەپیسەی کەویێ
تیری «ئیمامی حوسێن»
شەو درەنگە بۆ ژوانێ
سەر بە تاڵی مل بەکوێن
❁ «کاڵیلیێ»! وەی «رابیلیێ»!

دەمەرِۆ دەردت لە گیانم
ئەو مەکرەی لە منی دەکەی
بە دوو ماچێک نایتوانم!
وەک پێشمەرگەی کوردوستان
ئاوارەی وڵاتانم
❁ «کاڵیلێ»! وەی «رابیلێ»!
تەیری پێت دەگرم لەنگەر
خۆشە سواری سینگت بم
هەر وەک لۆریەی چەوەندەر
❁ حەجەم دێ بە ماشێنی
دەپسێ سیمی رادیۆنی
میرزا «رەحمەت» بانگ دەکا:
بە لۆری قەندی دێنی.
گاووگەردوونێ دەکا
هێندی «ئەمیر» بیدوێنی.
مەلا «سەدیق» بەرِێ بوو
دەگەڵ کاکە «رەجیم»ی
مەلا «خەلیل» بەرِێ بوو؛
دەگەڵ مەلا «حوسێن»ی
هەر چواریان فتوایان دا:
نابێ «قازی» بمێنی
❁ هەنار و سێو و هەنجیر

له نێو کوردان بۆ تەگبیر
ئەمن میرزا «رەحمەت» نیم
بێنە دەرکێم سەد فەقیر
ئەمن ماڵە «تاغی» نیم
بفرۆشم لۆرک و پەنیر
«محاڵ»ی «شارویران» نیم
کاسپێکەم بێ بە حەسیر
خۆ ئەهلی «سابڵاغ»ێ نیم
پووت پووتە ئاردی بکڕم
بیشێلم هەویر هەویر
مەلا «سەدیق» بەڕێ بوو
دەگەڵ کاکە «رەجیم»ی
مەلا «خەلیل» بەڕێ بوو
دەگەڵ مەلا «حوسێن»ی
چوار بە چوار لێیدانیشتن
کاریان دانا بە تەگبیر
هەر چواریان فتوایان دا:
بخنکێ «قازی» فەقیر
❁ «نەڵێن»ی بێنە خوارێ
یەکسەر بۆ «خانەقا»یە
دەستەونەزەر راوەستن
بە دڵ بۆی بکەن دوعایە

ئەو سێدارەی چەقاندیان
لە راستی «چوارچرا»یە
یەک بۆ «سەدرو ئیسلامی»
یەک بۆ «حەمە حوسێن خان»
یەکیان بۆ «پێشەوا»یە
پاشای کوردانیان خنکاند
رەبی کوێراییم دایە

ئەی مەلەنگێن
قالە شین

شەڕە لە بنەی بە تیسوێ
گاڵتەی لە بنەی بە تیسوێ
چەندم کوت «خدرەی بەسێ»
بە شەشخانان رامەسێ
دووت کوشتوون مەیکە بە سێ
✿ «ئەی مەلەنگێن، مەلەنگێن، مەلەنگێنە
سووک بڕۆ گوارەکانت مەلەنگێنە
پانیەی کەوشەکانت مەچەسپێنە
لە سەر جەرگم مەیسووڕێنە»
✿ شەڕە لە بنەی بە کیفار
گاڵتەی لە بنەی بە کیفار
بێری هاتن بیست و چوار
«خدر»ەی مامان بریندار
✿ شەڕی دە وام نەدین قەت
لێک رۆنیشتبوون حاشیرەت
مەسڵەحەتیان ناکرێ قەت
✿ شەڕە لە بنەی «باسکۆک»ێ
گوللەم دێنێ وەک نۆکێ
مەگوژن لاوی «فاتمۆکێ»

❁ غەم و تاڵیم زۆر لە مێژە
قەبرم بە گوڵاوێ داڕێژە
هەتا «لەیل»ێ دێ مەمنێژە
❁ دوو کۆترم دی لە ماڵێکی
هەر دووکیان باڕی ساڵێکی
ماچیان دەدا بە «ریاڵ»ێکی
❁ ئەگەر دەڕۆی ئاگام لێت بێ
مژۆڵم گەسکی سەر رێت بێ
نەوەک دڕوێک وەبەر پێت بێ
❁ «چاکی قۆرغێ»م دی بە خەوێ
بە دڵ لێوئاڵم خۆش دەوێ
لێکیان کردین ماڵیان شێوێ
❁ غەمی خۆم و دەردی دووان
ڕەنگم زەرد بوو وەک مردووان
چارەم ناکرێ بە نوشتووان

قەوماوە قەوماوە
قالە شین

بێزارم بێزارم
لە «برایم خان» بێزارم
هەرچی دێت و رادەبرێ
دەڵێ باوەژن دارم
❁ قەوماوە قەوماوە
«حەزیم» لە باڵە خانە
«رەسووڵ» لە باغچەی ساوە
هەتیو دەست و بردت بێ
تا کوڕەکەم هەڵنەستاوە
لە «ئێران»ێ هەڵگیرا
لە «عێراق» دامەزراوە
بە حوکمی «شا بەندەر»ی
سەد پولیس بۆی دانراوە
❁ «قەوماوە قەوماوە
لە «برایم خان» قەوماوە
خەبەرێکی ناخۆشە
«حەزیمە» هەڵگیراوە
❁ «حەزیمە»ی تەنک و رەندە
«رەسووڵ» کوڕی گۆوەندە

چنگێ لیرەی دەرهێنا
قیمەتی ماچ ئەوەندە
❁ حاشایە حاشایە
ئەو ساڵ ساڵی حاشایە
لەبەر «حەزیمە» خانم
دەڵێی کچە پاشایە
«حەزیمە» لە تالارە
«رەسووڵ» لە باوەش دایگرت
وەرە داد لە «کارەسوو»ی
جا وەرە «حەزیمە»ی هەڵگرت
❁ «حەزیمە»ی تەسک و رەندە
کوڵمەی وەک بەفر و قەندە
«حەزیم» لە سێ نۆهۆمی
«رەسووڵ» لە باوەش دایگرت
وەرە داد لە «کارەسوو»ی
جا وەرە «حەزیمە»ی هەڵگرت
❁ کوڕەکەی هەستا لەخەو
بابە دایکم نەماوە
رۆڵە مەیکە بە قاوە
قەحبەیە و هەڵگیراوە.
کوڕەکەی بێ تاقەتە
دەگەڕێ مەزرا و کێوی

ئەوەی دایکم پێ بڵێ
دەیدەمێ زێڕ و زێوی
❁ کوڕەکەی بێ تاقەتە
دەگەڕێ مەزرا و مووچە
ئەوەی دایکم پێ بڵێ
دەیدەمێ زێڕ و گەنجە
❁ ئەرێ جووتێکماینی شێ
هاوار دەڕۆن لە رێیە
بە خودای ئەوە «رەسووڵ»ە
دەڵێن «حەزیمە»ی پێیە
❁ قەوماوە قەوماوە
لە بەگزادان قەماوە
خەبەرێکی ناخۆشە
«حەزیمە» هەڵگیراوە

فاتمۆکێ
رەسووی نادری

کوڕێک فەقیر بوو. ئاشقی کچێکی دەوڵەمەند بوو. ئەمما چونکە ئەو فەقیر و ماڵە بابی کچەش دەوڵەمەند، نەیاندەدایە. کوڕەکە زۆر داغدار بوو لەوەی‌کە نەیاندەدایە. «فاتم»یان بە مێرد دا. ئەگە هاتن بۆ «فاتم»ێ، کوڕەکە لە گوێی بانی راوەستا بوو. سوار لە دەرکی ماڵە «فاتم»ێ تێک‌کۆشان. ئەو دەمیش‌ئاهەنگ وا بوو بۆ بووکێ:

نایەتە دەر، نایەتە دەر
بووک یاغی‌یە و نایەتە دەر
ئەسپی بووکێ ئەسپی شێیە
نایەتە دەر، نایەتە دەر
بووک مەترسە زاوان پێیە
نایەتە دەر، نایەتە دەر
ئەسپێ بووکێ شێ نێ بۆزە
نایەتە دەر، نایەتە دەر
بووک مەترسە زاوا قۆزە
نایەتە دەر، نایەتە دەر
لەبەر دەرکێ وڵات ئاڵۆزە
نایەتە دەر، نایەتە دەر

جا بە جێی ئەو «نایەتە دەر»ەی، کە «فاتم»یان هێنا دەرێ و لاقی دە ئاوزەنگێ نا و خۆی هاویشتە سەر خوانی زینی، کوڕەکە کوتی:

«فاتمۆکێ» کوێستانی مە «سوێناس»ە
«فاتمۆکێ» برۆت تیخی ئەڵماسە
«فاتم»ە جوان نیشانەی خۆت وەناسە

ئەنگوستیلەکەی پێشانی «فاتم»ێ دا. ئەوی هاتبوو بۆ بووکێ هەمووی زانیان کە ئەو کوڕە دەگەڵ ئەو کچەیەتی. کوتی:

«فاتمۆکێ» چەند بە چۆماندا هاتم
«فاتم»ە جوان شەختەی پایزان ئەنگاوتم
بووک فاتم لە تەڵەب ماچێک هاتم
❁ «فاتم»ە جوان کوێستانی مە «گەدە»یە
«فاتمۆکێ» سەر بە گوڵینگ و شەدەیە
«فاتمۆکێ» مەڕۆ ماچێکم دەیە

هەر کەیخودای کە دەگەڵی بوو، ئایا کوێخا بوو، ئایا سەردار عێل بوو؟ ئەی ئاغا بوو؟ کوتی ئەو بووکەی دابەزێنن. ئەو بووکە ئی ئەو کوڕەیە.
بووکیاندابەزاند و بە ئەمری شەرح مارەیان کرد و دایان بە کوڕەی.

نیزام نیزام
عەلی کەردار

کزە کزێک دێ لە دەروونمەوە
ئەوە پاڵی دا بە مردنمەوە
نیزام نیزامە یار ئازیزەکەم
میوەی رەنگاورەنگ شەو پایزەکەم
❁ چەندەم پێخۆشە دەست بۆ گەردەنی
خونچە گوڵێک بووی بۆخۆم دەمتەنی
نیزام نیزامە خۆم کوڕە سەرباز
تۆ مەرگی کاکت مەمکووژە بە ناز
لێرەم ناهێڵن دەمبەن بۆ «شیراز»
❁ دوو سێو، دوو هەرمێن، دوو گوڵن لە باغت
ئەجەل هاوردەی کوشتەی بەیداغت
نیزام نیزامە یارەکەی خۆمی
گوڵی نێو باغان کەنێرەی چۆمی
خۆم دەرتدێنم لە بەندی «رۆم»ی
❁ دەستم دامێنت دەگرم کەمبەرت
ماچێکم دەیە سندووقی سەرت
نیزام نیزامە خۆم کوڕە نیزام
سجیل بیست و دووم وەرەقم تەمام
حەز دەکەی نەمرم تاوێک وەرە لام

کراسەکەی بەرت گوڵ پەناباتی
خەبەرم دایەی بۆ وا درەنگ هاتی؟

هەستە بەیانە
عەلی کەردار و قالە شین

شێتان شێت دەبن، دەچن بۆ کابە
من بۆ تۆ چۆنم، تۆش بۆ من وا بە
❁ راوە باز خۆشە لە دەوری شاری
ئەنجوومەن سوار بوون دەگەڵ سەرداری
مەمکت پایزە سێو، بۆم بێ بە دیاری
❁ بەری بەیانی، سیرەی فینجانی
لەو دێیە چکۆڵە، تۆم بە جوان زانی
کاری ئەمن و تۆ، عالەم پێی زانی
❁ هەناسێک لە من، کزێک لە شەماڵ بێ
سەبەبکارەکەت بە کۆی زووخاڵ بێ
❁ زوولفەکەت بێنە بیکەم بە شانە
با لێی نەکەوێ تۆزی گۆڕخانە
❁ هەســتە بەیانە، ســیرەی فینجانە
ئەگریجە و لاولاو، بە جووت شەڕیانە
خۆم بە قوربان، شان و کوڵوانە
❁ هاتنەوە بە جووت «ئێران» و «ئایشێ»
ماشێنێک دەکرم بۆ شەوگەردووشێ
لە قۆرغی ساوا پێی دەکەم عەیشێ
❁ داری دارمێخەک تازەی گوڵ داوە

یاری مێرمنداڵ لە خەو هەستاوە
دەسرە و دووگردی لە ملی هاڵاوە

گوڵاڵە سوورە
عەلی کەردار

هەوەڵ لە داخت، دووهەم لە قینت
خۆم دەخنکێنم بە لکی پۆشینت
لە سەر کام دینی دێمە سەر دینت
«گوڵاڵە سوورەی سەر گۆنەی یارم
یەخسیری غەمزەی چاوی بە غومارم
بۆ روحمت نەکرد بە دڵی غەمبارم»
❁ چۆن دەبێ وا بێ لەو عەیامەی‌دا
رەش‌مار پێچی خوارد بەو نەمامەی دا
❁ خۆزگەم بە دەرزی تیژە، تەنکە
دەروازەبانی سینگ و مەمکە
گوڵاڵە سوورەی سەر کولمی یارێ
داتگرتم بە تیر دوێنێ ئێوارێ
کێ تەفرەی داوی بەردی لێبارێ
❁ دەترسم بمرم قەبرەکەم غار بێ
«ئیزرائیل» لە چنگ ناڵەم بێزار بێ

دەپێشدا گوڵم دەپێشدا
عەلی کەردار

نەخۆش و دەردەدارم
ڕەنگ زەردم، لێو بە بارم
بۆیە بەرگەکەم شینە
بۆو کچۆڵەی تازیەبارم
«دەپێشدا گوڵم دەپێشدا
دەڵێ بۆ دوایە نابم!
چاوت هەڵمەتەکێنە
دەترسم هەڵوەدا بم»
❁ دەسماڵ کەتانی «بانێ»
باریکێ نەشمیلانێ
جارێک پێم بڵێ: هەتیوە!
حەوت ساڵ دەچمە زیندانێ
دەپێشدا گوڵم دەپێشدا
دەڵێ بۆ دوایە نابم
کۆترم هەڵۆ لێم دەدا
❁ دەوای دەردی بیماری
لە نێو سەد دۆستان دیاری
قوربانت بم «پیرمحەممەد»
چاکی تیراوێ داری

ئەوە دەچمە «نەغەدە»ی
چت بۆ بێنم بە دیاری
❁ برۆی ئەو چەرخ و فەیتوون
عەمرەکەم «زارا خاتوون»
دوێنێی تیرێک لێداوم
چارەم ناکا «ئیفلاتوون»
دەپێشدا گوڵم دەپێشدا
دەڵێ بۆ دوایە نابم!
سەبەب کارەکەت عەمری نەمێنێ
شێوەرد من دەیبڕم کێ دایدەچێنێ
دێمە سەر سینگت تا مەیلم دێنێ

کیژ دەڵێ خۆشم دەوێ
عەلی کەردار

بەو گوارەی بە گوێتەوە
وەختە سوێم بۆت بێتەوە
سینگت بەفری کوێستانێ
بە شنێک با دەتوێتەوە
کەللەی سەرم لێ ون بوو
؟DEL
«کیژ دەڵێ خۆشم دەوێ
هەر دەڵێ خۆشم دەوێ
میوانی رۆژ و شەوێ
لە من و لە کابرای مێردت
کێهامانت خۆش دەوێ
ئەو حەیفە ئەمنی کوشتووە
دانیشتووی سەر بە هەوێ»
❁ دەردت وێم کەوێ «ئامین»
لێت بڕیوم هێز و تین
بە قوڕعانێ سەر پەڕ شین
کوتم ماچێکم دەیە
دنیا هیچ نێ هەر دەمرین
چرکەچرکی مەمکت دێ

هەر وەک سەعاتی «لۆژین»
❁ «کێچاوا» و «گابازەڵە»
خۆشم ناوێ دەغەڵە
موسەلسەلی سەنگینە
سێ خەشابی دەگەڵە
دەستم بۆ زیارت دەبێ
چونکی فێرە باغەڵە
❁ یا «مووسا»ی کێوی «توور»ێ
لە پووڕێ دەچمە ژووڕێ
خودا لە گولەی نەبووڕێ
چوون دڵی ئەو گوڵەی دێشێنن
بۆ شیری بزنە سووڕێ
❁ بەفر بە بای دەتواوە
ڕوومەتت شەکری خاوە
کافرم، جووم یا هەرمەنیم
شادەم بەو گوڵەی هێناوە
بەلەکت وڕەی لۆکەی
هەللاج هەڵیپێچاوە
بوومە چەرچی ئەو نێوە
ئەشیام پێیە و نافرۆشێ
ئاوری لە من بەرداوە
کچەکەی «وەستا مۆشێ»

❁ کەوی زینوێ «میرقاز»ی
سەقری «مەلا بادین»ی
دەچم ئاوت بۆ دێنم
لە بناری «ئاڵەشین»ی
چاوجوان لە خودام تەڵبە
خێر لە گولەکەت نەبینی
❁ بە غەمزە پێدەکەنێ
زولفت جۆری قۆشەنێ
دەوری کوڵمەیان گرتووە
ناهێڵێ ماچم دەنێ
با هەرتک چاوم کوێر بێ
شەوێ دەنووی بە تەنێ
❁ تۆ قەڵا من لەشکرم
حەو ساڵان دەورت دەگرم
یان دەتهێنم یان دەمرم
❁ عەمر و دیدەم شەکرە ژن
سنگ کاڵەکی گوڵ پرچن
قاشت کەن بتدەن بە من
قەیناکە لە غەریبی
با لەسەر تۆ بمکووژن
❁ قورینگی لە دەم گۆلاوان
بێری سەر کانی و ئاوان

حاڵی کردم بە چاوان
لێرەڕات لە سەر گێڕم
تا «سەهەند» و «سۆڵاوان»
تازە مەیلت بەرنادەم
شەرتە بە شەرتی پیاوان
❁ خەڵکی «محاڵی شازادە»
تەسک و لووس و یەکبادە
دەخورێ دەڵێی زەوادە
نەرمە دەڵێی لبادە
لە سەر چاوی جوانی تۆ
شۆخی گەردن بیجادە
با تەیارە بمسووتێنێ
هەر وەک «نانەوازادە»
❁ دەردت لە ماڵم خاتوون
ئیمانم بووە زەبوون
ئەوجار دەچمە گەرمێنێ
بۆت دێنم پارچەی «گریفوون»
ئەو تیرەی لە منت داوە
چارم ناکا «ئیفلاتوون»
لە سەر باڵات شەڕیانە
«رووس» و «ئینگلیس» و «ژاپوون»
❁ لە خشەی بازنە و تاقڕانی

لە یەکیان دا بەرانی
دەنگیناڵە و نرکەی دێ
وەک ساڵەکەی «ئەرکان»ی
کە «عورووس»ەکەی وەدەر نا
لە «کەلبەرەزاخان»ی
❁ کەوی نیسێ و نزاران
باشووی سەر لکی داران
کەروێشکی پێشی سواران
کراسەکەی زۆر تەنکە
دەدڕێ بە دوو هەناران
❁ تەیر و توور و شەهێنێ
باز لە ئاسمان دەخوێنێ
فەسڵێ گولە هاتەوە
لیکی لەسەر دەچێنێ
پەککوو کوێراییت دایە
پیسە عەمرت نەمێنێ
«شێخە سوێینی» بێتەوە
هەشت گەز پارچەی بۆ دێنێ
بیکە کراسی کەمەرچین
با گولەت وەرهەم هەڵێنێ
❁ عەمر و دیدەم بەڵەکچاو
هێندی لێم ناوی شەواو

بۆ تۆ نەمام «خاتوون» ناو
لە سەر سەرتی دەگێڕم
«بۆکان» و «کۆنە میاندواو»
❁ لەگەڵ تۆمە برا گیان
ئەوەڵ دین نوێژ و ئیمان
سەماوەرێکی هەشتی
لەگەڵ دەستێک ئیستیکان
«بڕنوو»یەکی قوڵەت بێ
لەگەڵ سێ قەد فیشەکدان
جووتێک «چەکمەی مووسڵ»ی
لەگەڵ ماینێکی کەحلان
چیغ و ڕەشماڵ و چادر
ئەستوندەکی حەیزەران
سەد مەڕی کووڕەت هەبێ
لەگەڵ دۆستێکی زۆر جوان
ئیسراحەتی لێبکەی
لە ریزی دەوڵەمەندان
شازدە پێستە رۆن دەگرم
تۆ بێری بی «ئامین» گیان

قۆنگرۆکێ

ڕەسووڵ شیرمۆخ و سمایلی حاجی

«قۆنگرۆکێ» لە دم ڕووباری
لە بنی گوێیانم خۆش دێ
خرمەی پیادە و سواری
«قۆنگرۆکێ» هەر بە حوکمی جەباری
خوێن لە ڕمبان دەباری
❁ «قۆنگرۆکێ» لە بەر چیایە
مەردی چاکم «عەبدوڵلا»یە
دەڵێ: حازرم بۆ دەعوایە
شەڕ بە شیر نەبێ پێک نایە
هەی ئافەرین ڕۆڵەی دایە
❁ «قۆنگرۆکێ» لە بەر ئەشکەوتێ
کدووانم پێدا بکەن
هاوار چرۆقەم کەوتێ
❁ «قۆنگرۆکێ» لە بەر تەلانی
لە بن گوێیانم خۆش دێ
هازەی گوللان، دەگەڵ بۆنی دەرمانی
«مام ڕەسۆک» هەڵنەیەی
ئەتۆ خوارزای «سەکر»انی

❁ «قۆنگرۆکێ» له «بەردە گوێز»ێ
سواران مردن له ڕێزێ
پیادان بگرن مەتەرێزێ
شەڕ کەوتە محەللەی دە «تەورێز»ێ
شەڕ له بەر شێران قەت نابێزێ
❁ «حاجی‌لۆک» دەڵێ ئەمن حاجیمە
ساحێبی «قۆنگرۆکێ» پێسپیمە
بە سەرێ ئاغای خۆم غەیان نیمە
بە وان «قۆنگرۆک»ان رازی نیمە

دەبا لێنێین پێشباران
محەممەدی خەلیل‌شا

دەبا لێنێین پێشباران
خێڵ هاتن گەروو گەروو
کیژ گەڕاوە دوای خێڵێ
تێکەڵ بوون بازنە و مووروو
نازدار بێنە ماچت کەم
حدوودی جانوو لە دوو
❁ خۆشە سۆزەی زریانی
فێنکە زینوێی «دەرمان»ی
پۆلێکم قورینگ دەدین
لە سەر پاردەی «سوڵتان»ی
خۆزگەم بەو کەسانە کا
دەگەڵ وانیش جیرانی
❁ دەبا لێنێین بارگرانان
خێڵ هاتنە کەند و لەندان
خێڵی«قادری سێمانی»
هەڵیدا لە «سامرەندان»
نازدار بێنە ماچت کەم
لە گەڕی دە گۆوەندان
❁ بەژنی تۆم دارە، چ دارە؟

دارەکەی سەر جۆیی ئاشی
بەغیلیانت پیَ نابەم
ببیە حاکمی «سووورباشی»
ئەو حەیفانەت دەمکوژیَ
دەگەڵ گولەی ویڵداشی
❁ چووومە سەری «سوڵتان»ی
دوو قورینگم هەڵدەفڕاندن
جا پێم لە پێش ویَ دانا
دوو گوڵم لیَ هەڵدەپساندن
ئارەقەی سینگ و مەمکان
سمێڵم پیَ رەنگاندن
❁ دەبا لێنێین پێشباران
لە مەڕان هاتە هاتە
کیژ گەڕاوە دوای خێڵی
دەڵێی قۆنگرە و قەڵاتە
کیژیَ بێنە ماچت کەم
لێم چۆل کردۆ وڵاتە
❁ دەبا لێنێین پێشباران
پێشبار باریان گرانە
دەڵێم بێنە راتمووسم
دنیا دەوران دەورانە
❁ دەبا لێنێین پێشباران

پێشبار هاتن بە لەنگەر
یارێکی چکۆڵەم گرتۆ
قەد باریک و رەشئەسمەر

گۆزە لێلێ، گۆزە لێ
محەممەدی خەلیل‌شا

رەبی بنچینەی بخزێ
گۆزە لێلێ، گۆزە لێ
دەچمە راوی کارمامزێ
گۆزە لێلێ، گۆزە لێ
❁ ئەگەر ئاغا بمخنکێنێ
گۆزە لێلێ، گۆزە لێ
ئەو کچەی دەبەم بۆ گەرمێنێ
گۆزە لێلێ، گۆزە لێ
❁ گۆزەی هەڵگرت چوو بۆ ئاوێ
گۆزەلێ لێ گۆزەلێ
تیرەندازی تیرت باوێ
گۆزە لێلێ، گۆزە لێ
❁ چاوت رەشن وەک چاوی داڵ
گۆزە لێلێ، گۆزە لێ
برۆت تیری «رۆستەم»ی «زاڵ»
گۆزە لێلێ، گۆزە لێ

وردەقام

غەمان دامەگرە، غەمت بارم بێ
«سابڵاغ» بە بێ تۆ بە زینهارم بێ
❁ شۆقی زێڕەکەت داویە لە ئەژنۆم
هێزی لاقم نیێ بە کوێدا بڕۆم؟
❁ دەترسم بمرم لە جاڕی جۆدا
خوێنم بڕژێنن بە سەر لیمۆدا
❁ بینێ سەر دڵم پەنجەی شمشاڵت
بێنە بیمژم دوو لێوی ئاڵت
❁ شلکە «شەرافەت» خرینگە و مەنگۆڵە
هەڵگرە گۆزەکەت کانێکە چۆڵە
❁ خۆزگەم بەو ماڵەی دەستاڕی لێیە
شەقەی ماچ و مووچ ئەوە لەوێیە
❁ لە نێو کوردوستان شین و گریانە
ئیجباری کوردی لە کرماشانە
❁ «خورشیدەی خاوەر» سەرقافڵەباشی
چەپکێک گوڵ بچنن بیبەن بۆ ئاشی
❁ وەرە با بیکەین دوو دەست لە گەردن
نەوەک پەیدا بێ لە نەکاو مردن
❁ شنەی دارەبی لە مەزەی قۆرە
خودا هەڵنەگرێ ئەو زوڵم و زۆرە

❁ شەرتە لە داخت لانک لە کۆڵ کەم
بچمە ئیجباری پێش چاوت چۆڵ کەم
❁ نەمامم چەقاند باغم بەر بێنێ
لە جیاتی لیمۆ، سێوی کاڵ دێنێ
❁ بێنە بۆ خاتر تاقە براکەت
ئەو لام ماچ کردۆ، بێنە ئەو لاکەت
❁ نەمامم چەقاند باغم بەر بێنێ
تۆ بدەن بە من کاکت ژن بێنێ
❁ کۆلکەی ددانم پای شەخسێ دێشێ
نە جێی دەرمانە و نە گاز دەیکێشێ
❁ کام جێیە بەرزە بیکەینە بێستان
شەمامە بگرین بۆ دەستی دۆستان
❁ دەرزی یەخەکەت تیژ و تەنکە
چونکە نیگەهبان سینە و مەمکە
❁ چوومە ئەو بانە درکێ دای لە پام
دەرزی یەخەکەت بنێرە بۆ لام
❁ کوڵمە ئاڵەکەت بە بای باوەشێن
هێندە ناسکە پڕ دەبێ لە خوێن
❁ شەماڵ وەرە کزەی جەرگم
خواردن ژەهرە و جوانەمەرگم
❁ هەردەم لەبەر سەدای یاران
گوڵ دەبارێ وەکوو باران

❁ دڵا لە کانێ حیلەی ئەسپی بەند
دۆستی جوانت بێ، دەسگیرانی رەند
❁ چاوت ئەستێرە، گرشە گرشێتی
یارم ئارەزووی خرچەی ترشێتی
❁ دمت هەنگوینە لە کاتی شین‌دا
دایکت مەلعوونە لێم چۆ بە قیندا
❁ کێوان یاغی بوون، رێ نادەنە پێم
کارم خەلاس بێ، بۆ خزمەتت دێم
❁ کراس زەردێ ئاڵ و ئابی
شەرمەندەی قاپییەی خولا بی
❁ بەوەی مەزانە پیر بووم، فەوتاوم
خونچەی باغی تۆم پەروەردەی ئاوم
❁ مانگەشەو خۆشە با بچینە کۆلکان
وەختێکی وا دێ کیژ بە دوو هێلکان
❁ بەو مانگ و رۆژە، بەو قرچەقرچە
مێردە گولەکەت وەک پیرەورچە
❁ چاوم چاوەڕێی رێگەی بەر ماڵتان
خۆ من گاور نیم کەوتوومە داوتان
❁ کانی بەر ماڵان تۆقەی تێکەوێ
کەنگێ یارم دێ چاوم پێی‌کەوێ؟
❁ رێگا بە دووری، مەیل بە کەمی
بۆ لە کنت نەما شەرتی ئادەمی؟

❁ هەڵیتەکێنە، گەنمی دێی کۆنە
کیژی حیزدایک بێ سەر و شوێنە
❁ هەڵیتەکێنە، گەنمی مەلایە
کچی باوەحیز قەت بەکار نایە
❁ هەڵیتەکێنە، چەتۆرەی پێوە
بمگرە بە نۆکەر بۆو دەم و لێوە
❁ هەر من دەزانم قەدری گوڵانت
مەیدە بە خەڵکی خاڵی لێوانت
❁ قوربان کۆچەکەی «ئەحمەدئاوا»ت بم
لانکە راژێنی کۆرپەی ساوات بم
❁ تیری موژگانت دەڵێی غەدەنگە
دەگەڵ هەرکەسێ خەریکی جەنگە
❁ کەپرێکی دەکەم لە بەردی مەڕمەڕ
باوەشێنت کەم بە ریحانەی تەڕ
❁ قالییەکەت داخە گوڵ تیکەتیکە
یار مەیلی لێ بێ ماڵمان نێزیکە
❁ ئەو چاوە رەشەی بوون بە کەمەندم
سەبارەت بە تۆ من لێرە بەندم
❁ شەرتە یار بۆت بێ دە جێژوانەوە
قەت دۆستم ناوێ بە پاڕانەوە
❁ هەر گولە پیسێک چاوی ئاو دەکا
بۆخۆی لێی دەنوێ، ژنی راو دەکا

❁ خۆوه هاتەوه ماشێن پۆستەکەم
کوانێ جوابنامەی کۆنە دۆستەکەم؟
❁ بەو مانگ و رۆژە، بەو چرا گەشە
گولەکەت بمرێ بە کۆخەڕەشە
❁ نوشتە چکۆڵەی دوو شایی بایی
قسەی پڕ و پووچ کەوتە ئاوایی
❁ خودا خودامە زوو رۆژ بێ ئاوا
دەستێ بگێڕم لە باخچەی ساوا
❁ خۆم کوڕە سەربازی مرخی دڵ مردە
تۆ کچە سەروانی بە گوڵاو پەروەردە
❁ چاوت ئەستێرەی جەدیدە
عەکسی تۆم «شێر و خورشیدە»
ئاشقی باڵات بووم نەدیدە
❁ بۆ کوێ دەڕۆی پێ بزانم؟
تەشریفت بێتە گوێی بانم
شینت بۆ بکەم تا دەتوانم
❁ «ئایشیلێ» جاران زۆر چا بووی
چەند یارێکی بە بەقا بووی
بەزار چۆن بووی بە دڵ وابووی
❁ باڵا بەرزەی کەڵەگەتێ
ئەگەر دەستێکم بتگاتێ
دەتهێنمە رێی مەسڵەحەتێ

❁ هەتا جحێڵ بووم خەتم نەدابوو
کچ لە بابی خۆی بۆم تەوەلابوو
ژن لە مێردی خۆی بۆم لە حاشا بوو
❁ هەتا گوڵ بووی سوورەگوڵ بووی
وەک ریحانە چڵاوچڵ بووی
تووشی مێردی نابەدڵ بووی
❁ هەتا کەنگێ نامکەی بەخێو
هەتا کەنگێ بم دڵ پەشێو
برژۆڵ تیری «ئەرژەنگی دێو»
❁ شلشل بمکوتە لە نێو جاڕی جۆ
جێگا قەبرەکەم نێوان مەمکی تۆ
بەو لەبزە شیرنەت بفەرموو مەڕۆ
❁ شەماڵ بیشنێ یەخەی کەتانی
گەرمای گەرمەسێر دەرکا لەگیانی
عەیبت تێدا نیە بەینەڵڵا جوانی
❁ ئاوێک دێتە خوار لە باسکە و باسکان
کەوێک دەخوێنێ دەگەڵ دوو ئاسکان
دەبا تێکەڵ بن سمێڵ و بسکان
❁ هەڵیتەکێنە، قەزات لە ماڵم
سەر گۆی مەمکەکەت دەدرێ لە باڵم
لە خودام تەڵەبە ببیە حەڵاڵم
❁ ناویە بە سەریا کێش بە دوولانە

جحێڵ بە دوو شت دەبن دێوانە
کوڕ بە ماچ و موچ، کچ بە لەرزانە

ئەم بەندانەم لە زمان محەممەدی خەلیل‌شای، حەمەدی ئاغای، عەلی گڵێنانی، مەلا حوسێن و برایمی قادری وەرگرتووە.

دەبەر ئەو بەژنەت دەمرم
راستە وەکوو منارە
خزمینە لۆمەم مەکەن
تازەم گرتۆ ئەو یارە
یاخوا ئاگاداری بێ
سەد جار ئەو شێخەی «بیارە»
غەم لەشکری کێشاوە
سەر پاکی نێزەدارە
۞ دەبەر ئەو زوولفەت دەمرم
تازەت دانا «قەجەر»ی
جارێکی لێم ناپرسی
تۆبڵێی کابرا کوێندەری؟
لە بۆ گەرمای هاوینێ
چاکم بۆ چەتری سەری
هەموو کەس دۆستی خۆی گرت
ئێمە خۆڵمان وەسەری
۞ وا چاکە، وا سەڵاحە
تاوێک بێیە ئامێزێ
هاوار حەزرەتی «غەوس»

ئەو گوڵەی بپارێزێ
قەولە دیاریم بۆ بێنێ
گوڵم وا لە «تەورێز»ێ
۞ کارگی ئەو «دۆڵە سیر»ە
قاش قاشە وەک پەنیرە
دوێنێکانە کاغەز بوو
ئەورۆ لێم بۆ بە لیرە
شەققەی لە کوڵمەی دێنم
عالەم پێم بڵێ سێتیرە
۞ هەنارە و سێوە و زێوە
شێخی ئەو نێوە نێوە
لاپ ئیشک بووم بە پێوە
ماچ کەم خاڵی ئەو لێوە
دایکی مەمکی داوەتێ
کوا وەکە منی دڵ پێوە؟
۞ باسکم وەبن سەری دە
کەڵەگەتەی بە عینوان
ئێواران «لاجان» خۆشە
سبحەینان «بەری مێرگان»
خۆشە دەگەڵ یارت بی
لەکوێستانی «سامرەند»ان
جووتێک گوارەی بۆ دەکڕم

له دوورِ و لەعل و مەرجان
با لێوئاڵ دەگوێی بکا
ئاوەدان بێ «شاروێران»
❁ ناسکۆڵە و نازەنینی
بە ماڵە «شەمسەددین»ی
یارێ پێی لە رکێفی نا
کەوتە سەر خوانی زینی
لە خودای دەکەم تەڵەبێ
خێرێ لە کەس نەبینی
❁ خۆمن چۆمی «سابڵاغ» نیم
سەرچاوەی ئاوی «لەند»ی
باسکم وەبن سەری دە
کابانی دەوڵەمەندی
وەباڵت بۆ دەکێشم
لەبار و شۆخ و مەندی
❁ دەبارێی دەڵێی بەفری
دەڕۆی بەحیلە و مەکری
هاڕەت دێ لە سەر باڵی
وەک کەوی باسکی «بەسەری»
❁ کەڵەگەتەی چاو شەهێن
«باستام بەگ» و «گردنەڵێن»
بە ماچێکت هەرزانە

«سەردەشت» و «درپکە» و «لاوێن»
ماچێکم لێ بردەوە
بە گریۆ و چۆڵەمەشکێن
شەو دەرنگە بۆ جێژوانێ
سەربەتاڵەی مل بە کوێن
❁ گەر یارم قەولم داتێ
وەدەزانم ئەمن شام
لە ڕێی کانێ تووشی بووم
هەمیەتی وێ نەدام
حەوت ساڵە دەگەڵ یارێ
مونتەزیرم بە تەمام
بە قوربانی چاوێکی
«بیرۆت» و «حەڵەب» و «شام»
❁ دەچمە وڵاتی«سندوس»ی
روومەت قەندی «عرووس»ی
تەمەننا دەکەم لە خولای
چارەی لەو گولەی نەنووسی
❁ گەردن زەرد و گەردن زەرد
گەرنێ زەردت هەڵماڵی
سەد بریا ئی من بووبای
سێ شەوان بە حەلاڵی
❁ سەری عاسمان بە هەورە

هەرمێی قازانجە گەورە
دوێنێ یارم بۆلام هات
بابی لێی دام بەو تەورە
❁ گوارە و کرمەک و هەیت و هووت
هەموو کەوتنە سەر خاڵی رووت
برژۆڵ تیری «سوڵتان مەحموود»
لە جەرگت داوم تاق و جووت
❁ ئەو کچە دەچێ بۆ مەڕی
پانیەی کەوشی مەڕمەڕی
کابرا وەکوو گۆڵی پیر
لە دوورڕا پێی دەوەڕی
❁ بەندم دێن بە تاق و جووت
عاشقم بە خاڵی سەر رووت
چاوم کەوت بە چاوی
نیشەی کەللەم بۆی دەبزووت
ماچت دەڵێی شەربەتە
رەحمەت لە قەبری مردووت
❁ لە سەربانی مزگەوتێ
بمسووتێنن بە نەوتێ
دەس لە بالآت هەڵناگرم
هەتا دنیا دەفەوتێ
❁ نەخـۆش و دەردەدارم

دەردەکەم بێ دەوایە
دەبەر شەماڵیش دەمرم
دەمێک دێ و دەمێک نایە
ڕۆژی بازاڕی«خوورگە»ی
لە کن ماڵی «قەڵا»یە
جحێڵ دەستە دەستە بوون
هاتنە سەیری «تووبا»یە
شیرمەشکی لە خۆی داوە
بێرەدۆشی ئاغایە
❁ نێوانی هەرتک مەمکت
کردمە قۆناغ و مزڵ
هەرکەس ئەو ژنە دۆستی بێ
مەقسوودی دەبن حاسڵ
وردە خەندێکی هاتێ
دەمی پشکووتن وەک گوڵ
❁ دۆستەکەم مێردی کردۆ
دەڵەیماینی بە ڕەختە
بە پێش چاومدا دەڕوا
هەموو رۆژێ سێ وەختە
سەیرە دڵم ناتۆقێ
روح لە جێیەکی سەختە
❁ خزمینە لۆمەم مەکەن

دینم بۆ یار بەتاڵە
دەبەر نێو سینگی دەمرم
وەک کوێستانی خاڵ خاڵە
هەرچی فکری لێدەکەم
چارەی ناکرێ مندالّە
❁ چاوت ئەستێرەی رۆژێ
هەنیەت مانگی زووالّی
تازەی سەر وەدەر ناوە
لە نێو هەور و سامالّی
بەدکاران چاویان کوێر بێ
زمانیان گەڕێ بە لالّی
پێیان نەهێشتین خۆشی
نیشانیان داوین تالّی
❁ هاوارە، خودا هاوارە
هاوار لە زینوێی مالاّن
لەیلەکەم بۆچی رۆیی
روحی بردم بە تالاّن
سەرم بە فیدای بالاّت بێ
کوشتمی دایکی مندالاّن
❁ چەند جوانە خالّی لێوی
بۆ دەگری و قورِ دەپێوی؟
تێیهەلّدە دە گولەی مێردت

به قەبری بابی خێوی
❁ تیرێکی وای لێداوم
ویشکی کردووم بە پێوە
بەژنی جوان و ڕێک و پێک
دەلـەرزێ دەڵێی مـێوە
ئەو گوڵە حەبای لەبەر کرد
وەڵڵاهی دنیا شێوا
هەر دووکی ئەسیر کردوون
ئەو نارنج و ئەو سێوە
شەرتە دەستیان لێ دەدەم
با بڕووخێ ئەو کێوە
❁ ئەو یارەم زۆر خۆش دەوێ
گەر دێتەوە لە کانی
بۆی لەو دینەی وەرگەڕام
هەروەک «شێخی سەنعان»ی
❁ مامزی دیوی گەرمێنێ
هەقی‌یە زیز بێ نەمدوێنێ
هەڵیدەگرم و دەڕۆم
با سوورم کەن لەخوێنێ
❁ بەسەردا، گیان بەسەردا
بەسەر دەشتی«لاجان»ێ
سەرو شەدەی تێکەڵ کرد

دەگەڵ پەلکی ریحانێ
❁ هەوری کردن گەواڵە
قیتە بڵیندەی رەشتاڵە
دەبەر ئەو مەمکت دەمرم
خڕە وەک پڕتەقاڵە
❁ بە شل و مل هاتێ خوارێ
زانیم ئەگەر غەمباری
پەنجەم لە نێو پەنجەی نێ
با پچین بۆ پاڕکی شاری
❁ شل و ملی نەرم و نۆڵ
خوێن شیرنی بازنە لە قۆڵ
لە سایەی جوانی تۆوە
پشکووت چیا و خڕ و دۆڵ
❁ بەژنت وەک ئاڵای «رۆم»ێ
جـەماعەتی لە بنــە
حەوت ساڵان دۆستی من بوو
ئەلعان بە من دوژمنە
❁ جەرگم بۆ تۆ سووتاوە
زانیم مەیلت نەماوە
بێ تەخسیر و تاوانم
چاو جوان لە من تۆراوە
دەچم نوشتەی دەنووسم

یارم نەبێ بەچاوە
❁ بۆت دەڵێم کەمە کەمە
وەک کوێستان سەرم تەمە
لەبەر خۆفی خودای نەبێ
بەو کچۆڵەی دەگرم شەمە
خۆ من کابرام نەکوشتووە
بۆ پێم دەکەی مەحکەمە؟
❁ هەناران و هەنجیران
دۆلاری لە نێو لیران
مەیلەی لە نێو پەنیران
پەسندی شا و وەزیران
بە تفەنگی بڕنوو لێم دەن
هەر پێت دەڵێم دەزگیران
❁ بارانە و بارانە
خانی ئەو دیوە و دیوە
لەسەر سینگی نازدارێ
سوێسنەی ساوا خەملیوە
کابرای دەبەم بۆ خوێیە
باری نۆ پووت و نیوە
❁ بارانە و بارانە
ئەلف و کاف و لام و نوون
ئاوری بەردا لە جەرگەم

لەنجەی «زێنەب»ە خاتوون
❁ خۆ من چۆمی «سابڵاغ» نیم
بێمە خوارێ لە «لەند»ی
خۆ من کاکە «رەحیم» نیم
ئاغا لە «باجەوەند»ی
خۆ من کارخانەجات نیم
بە تۆن فڕێ دەم قەندی
خۆ دەڵاڵ و دەسبڕ نیم
وەک «عەلی قەباکەند»ی
دێتە خوارێ لە لێژێ
هەر دەڵێی ئاوی مەندی
سەر کوڵمانی دەگەزێ
سەگبابی فەندی فەندی
❁ هاتە خوار لە «میرقاز»ی
بە کراسی «ئەمیرغاز»ی
سەد سۆفی، پێنسەد قازی
پاکی چوونە پێشوازی
تەگبیریان لە «نوقڵ»ێ کرد
مەمکی بگرن بە گازی
خوێنی جوانێ بنووسن
سەد میرزای سەر جەوازی
با بمدن لە سێدارە

هەروەک «پێشەوا قازی»
❁ با بێتە خوار و بێتە خوار
بێتە خوار لە «لەند»ی
هاڕەی بەرموورەکەی دێ
دەگەڵ ئاوێنە سەنگی
دەبەر سەر کوڵمەت دەمرم
دەڵێی سێوی دوو ڕەنگی
❁ هانایەت وەبەر دێنم
دووهەم وەبەر سوبحانی
خالەق تۆم تاق و تەنیا
تۆم بێ جێگا و مەکانی
مەقسوودان حاسڵ دەکەی
ئەتۆ «غەوسی گەیلان»ی
دەنگی گۆ و دوو قڕانی دێ
لێکیان دەدا بەرانی
لە منیان دەکردە شێلینگ
وەک ساڵەکەی «ئەرکان»ی
❁ با بێتە خوار و بێتە خوار
بێتە خوارێ گوڵەکەم
عەهدی خودا و ڕەسوڵان
کراسی «واڵ»ی بۆ دەکەم
❁ با بێتە خوار و بێتە خوار

بێته خوار به جارێ
دنیام لێ بۆته دیوار
دەترسم بکەومه خوارێ
❁ جوانی گەردن به خاڵی
باڵابەرز و لێو ئاڵی
یارەکەم سەیزادەیه
بۆ خۆم بەستوومه شاڵی
❁ شێتی باڵای بەرزت بووم
قەد باریکی، قەد بللوور
دەبمه دووربین بۆ چاوت
بۆ رێی نیزیک، بۆ رێی دوور
دەمکوت بێنه ماچت کەم
ئۆخەی یاری کراس سوور
❁ ئەگەر ماچم نادەیەی
ئەو تەفەنوونەی ناوێ
دەمرم دەبەر سەر کوڵمەت
بۆته سێوی«سێڵاو»ێ
سێبەر له من حەرامه
با بسووتێم لەبەر تاوێ
❁ ده وەره دەستم له ملی که
بۆت وەرگەڕام لەو دینه
قاقا دەخوێنێ یارم

دەڵێی کەوێ مل شینە
❁ هەنار نیە، هەرمێیە
چەندە خۆشە ئەو دێیە
عالەم کەیفی خۆیانە
دەمرم ئارەزووم لێیە
ماچی سەر کوڵمەی خۆشە
دەڵەی نۆبەرەی بێیە
❁ هەرچەند دەکەم دەکرێنم
ساتێک ئەو دڵەم ناسرەوێ
دەبێ نوشتەی لێ بنووسم
بەڵکوو رەگەڵم کەوێ
زۆرم تکا لێدەکرد
دەمکوت ماچێکم دەوێ
دەیکوت ڕێگام لێ بەردە
چت لە گیانی من دەوێ؟
❁ماڵە بابم «مرێم»ە
دایمە ئەو دڵەم پڕ غەمە
چی‌یە گوناە و تاوانم
بۆ پێم دەکەی مەحکەمە؟
❁ قوربانی زاری دەبم
پێی دەکا لایە لایە
قوڵکی بەری گەردنت

کانیه ده قۆرغت دایه
مەمکت تۆپی فتباڵە
منداڵ پێی دەکەن کایە
۞ «سوڵتان سەید وەقاس»
بڵیندە و باسەفایە
پیرێژنان دەچنە سەری
بایان دە لاقی دایە
گەورەکچان دەچنە سەری
بۆ مەقسوودی دنیایە
۞ بەیانی رۆژی جێژنێ
کچان دێن بۆ سەر کانی
هەر کەسێ چاوی جوانە
روحم بێ بە قوربانی
۞ میوانە هاتۆ لە دوور
گەردن وەک شووشەی بللوور
سەر کوڵمەی ئاڵ و جوانە
وەک گوڵاڵەی «شارەزوور»
۞ «سابڵاغ» کووچە بە کووچە
فەقەت جێی ماچ و مووچە
قیمەتی تەواو نابێ
کیژی مەمک هەڵووچە
۞ هەڵخە و بیخە قەتارە

هیچی بەجێ نەمێنێ
با گولە بێتە«مەجیدخان»
بمگرێ و بمخنکێنێ
❁ هەی کەوی کەوی کەوی
هەوراز و بڵیند و نەوی
ئەوە «عرووس» هاتەوە
لە بابت بەم «پەهلەوی»
❁ بە خودای عاسمان و عەرزێ
ئەو دڵەم لە بۆت دەلەرزێ
بەژن ڕەشەڕیحانە
شین دەبوون لەسەر حەوزێ
دەستم برد بۆ بەرۆکێ
دوو گوڵم هێنا لە تەرزێ
ئاوری بەردا لە جەرگم
یەک «خاتوون» و یەک «رەزێ»
❁ نەخـۆش و دەردەدارم
تەبم گەیوەتە چلی
هەموو تەسدیقی بۆ بکەن
دەستی بۆ بدەن لە ملی
پشتێنی دەسرەی هەوری
دەیبەستێ بە شل و ملی
شێت و شەیدای کردوومە

ئەو دوو چاوی بە کلی
❁ له «سابلاغ»ێ بەولاوە
قازی حوکمێکی داوە
دەوڵەمەندی وا هەبوون
سەد لیرەی بە ژن داوە
بۆ فەقیرێکی وەک من
بە وەی جەرگم بڕاوە
❁ له کوێستانان رێواسە
لە نێو باغان گێلاسە
لە نێو بەحران غەواسە
وەک رادۆی بە قسە و باسە
فیدای ئەو جووت مەمکت بم
دیارن لەو بن کراسە
ئەگەر دێ و رادەبری
مژۆڵت وەک ئەڵماسە
ئەتۆ لە عیشقی کێ دای؟
وەنازانی چ باسە
دەمرم بە ئاستەم ماوم
ماومە هەریەک هەناسە
هەر وەختێک ئەمن بمرم
تۆم قاتیلی خۆلاسە
یاڕەبی ئەو خودایەی من

لێت بستێنێ قەساسە
❁ هەناری «شارەبان»ی
دەرمانی سەد دەردانی
وەباڵت بۆ دەکێشم
دەڵێی مەڕێ «غەیلان»ی
ڕێک و پێک و لەسەر پێی
دەڵێی تانگی «ئەلمان»ی
❁ دەسماڵەکەی هەوری‌یە
کراسەکەی قەنەوزە
هەڵی کردە دەسماڵی
دایدا بارانە و تەرزە
قازی و مەلات فتوای دا
ماچی تۆ بۆ من فەڕزە
ئەگەر ماچم نەدەیەی
تێدەپەڕم لەو مەرزە
❁ سەرم بێ سەرگەردانی
روحم بێ بە قوربانی
دەڵێی ئاسن و پۆڵایە
روحمی تێدا نێ گیانی
❁ دەچمە سەیری چاوانی
با بمرم لە سوێیانی
هێندەی کافر و دڵڕەقە

به برینانم نازانی
❁ هەرچەند دەکەم دەکرێنم
تاقەت ناگرم بێ یارێ
لەبەر دایکی ناوێرێ
بێتە دەرکی حەسارێ
کێ باعیسی ئێمە بوو
یاخوا بەردی لێ بارێ
❁ لەسەر را دێتە خوارێ
عالەمی کرد دێوانە
ئەو باسکی سپی و سۆڵی
بازنەی زێڕی لێ جوانە
ئەگریجەی هاتە خوارێ
جوانی کردۆ بە شانە
❁ دەبەر ئەو چاوەت دەمرم
لەسەر یەکت داناوە
لە خودای دەکەم تەڵەبێ
هەرگیز نەبی بەچاوە
❁ نێوانی سینگ و مەمکی
دووڕ و لەعل و گەوهەرە
دەڵێ بۆ تۆم راگرتووە
هەتیوە قوڕ بەسەرە
رۆژی سێ شەممو و جومعە

دێمە جێژوانی وەرە
❁ ساتێ وەرە بەولاوە
بەو جۆرەی بێفایدەیە
ساز بە بچینە «زەمبیل»ی
کە نیازی تۆبەت هەیە
ئەو مێردەی ناسک کردت
بێحەینی دەتکوت سەیە!
❁ لە «کەندە گۆڕی سێلوێ»
تا دەگاتە «خاڵدار»ی
سوێسنە و هەڵاڵە و بەیبوون
دەگاتە رکێفی سواری
چاو جوانی شۆخ و شەنگم
دێنێتە خوار پێشباری
❁ لە رەندۆڵێ «شنۆ»وە
«لاجان» هەستێ بە «کۆ»وە
بریا ئاوریشمی خاو بام
بە لایەک زولفی تۆوە
❁ دار و بەرد و لێڕەوار
کوێستان و جێگا هەوار
لێکرا هەموو بێنە خوار
بۆ سەیری چاوی بەخومار
لەسەر پەنجە قوڵەکانت

دەکەم تۆبە و ئیستیغفار
لەراست چاوی تۆ نەبێ
نەزەرێ ناکەم ئەوجار
❁ خاسەکەوی کوێستانێ
چۆنی بگرم بە داوێ
کوڵمەت گوڵی سوێسنە
لێیدا گزینگی تاوێ
❁ قەد باریکەی «تیلەکۆ»
ئەمنت کردۆ رەنجەڕۆ
داتناوم دەستە و ئەژنۆ
میوانی چاوی کاڵم
سبحەی بانگی نیوەڕۆ
بە یەکجاریت بۆ بێنم
دەسماڵی «خانم مارۆ»
بۆ ماچێک نەدامێ
ئۆباڵی منت وە ئەستۆ
❁ بە ناو «سابلاغ» و «شنۆ»
غەمم یەکە، دەردم نۆ
دەیڵێم بەندی سەربەخۆ
میوانی چاوی کاڵم
سبحەی نوێژی نیوەڕۆ
یاخودا لێی مبارەک بێ

«کێش» و «نایلۆن» و «مارۆ»
❁ بەو قورئانەی لێم خوێندووە
بۆخۆم لە مەلام بیستووە
خێری ماچێک سەد رۆژووە
❁ خاسەکەوێ باسکە و باسکان
کولمەت هەر وەک هەرمێ ناسکان
ئاشق بووم بە قەرەبسکان
لە نێو لیران دۆلاری
ساز و سفت و لەباری
دەمت خونچەی خەندانە
تێیدا دوو ریز مرواری
چ خەتایەک رووی داوە
بەینێکە لێم کەناری
کیژە کوردەی موکریان
چەندە ناسک و نازداری
❁ گەرنی دەڵێی قومری‌یە
سەر بەگوڵینگە و دەرزی‌یە
دەمکوژێ خەتام چیە؟
تاو وەکولمەی ناکەوێ
لەبەر سێبەری بییە
«مامەش» و «مەنگوڕ» و «پیران»
جوانێکی وەک تۆی نیە

❁ بەو قوڕئانەی مەلا «خاڵە»
چاو رەشێکم دی لەو ماڵە
دەکوژێ پیری هەزار ساڵە
❁ «دارەلەک» و «خوڕخوڕە»
دەنێو بەحران‌دا دووڕە
سەرگۆی مەمکۆڵەی خڕە
ڕۆژێ ئەوەندەم بەسە
جارێک پێم دەڵێ کوڕە
❁ هەر واوە دێ و دەلەنگی
سابڵاغی بۆ دەفرۆشم
بۆ گوارەی «پیاڵە زەنگی»
بۆتە «ئاپۆلۆی چاردە»
دەڕوا بۆ کۆرەی مانگی
❁ عەمرو چاوم «ئایشێگوڵ»
با سەیرت کەم پڕ بە دڵ
پەرچەمت وەک قەڕەوڵ
روومەت کارگی «سامڕەندان»
ددان سەدەفی حەسڵ
❁ گەوهەر لە شاری «شنۆ»یە
کراسێکت بۆ دەکڕم
لە گوڵی دە لیمۆیە
یارم دێت و رادەبرێ

لێی دەکەم گفت و گۆیە
«ئایشیلێ» و «ئایشێخان»ێ ❁
سوێسنە لە نواڵەی «بانێ»
پەشمینەی لەسەر نانێ
بۆچی ئەوساڵ دەمکوژێ
سەیزادەی «سەهۆڵان»ێ
خاسەکەوی یان باڕی ❁
با بمدەن لە سێدارە
بۆ سەیری نێو بازاڕی
عەجەم کە ژنیان پیر بوو
بانگی دەیکەنێ قاڕی!

مەشکە

ئەم بەندانە لە زمان فەقێ حەولای کاوڵان،
ئایشێ حەلیحەیزی، رەسووی نادری، نووری هەمزەپوور، زێنەب شێرزاد و... وەرگیراون.

مەشکە بژێ بە یەکێ
لە بن داری مێخەکێ
❁ بەو قۆڕعانەی «قاجر»ی
دەستم مەشکەی ناگری
حەیران چۆتە لەشکری
❁ مەشکەم مەشکەی مانگا قوڵە
پێی رازی نێ خەرتەتوڵە
ئەو مێردەی زۆر نابەدڵە
❁ مەشکەم مەشکەی دار گوێزێ
رۆن بۆ کابرای پەرێزێ
خوا مەشکەم بپارێزێ
❁ مەشکەم لە دار هەنارێ
وەستا هات لە «بوولغار»ێ
«شیلان» ژاندی ئێوارێ
❁ مەشکە بژێ بەو شەوە
کا «محەممەد» وەدەرکەوە
هەی ماڵە بابم مەشکە
❁ مەشکە بژێ بەیانە

شۆڕە سوارم میوانە
جێگای لەسەر چاوانە
❃ مەشکە دەژێ لە «بینان»
دەچمە «کانێ شەمزینان»
با گولە بمرێ لە قینان
❃ مەشکە سوورم حەڵاڵی
لەبەر پشووی شەماڵی
«کاک سوور»، کاکم نەناڵی
❃ مەشکەم دەژێ لە نواڵان
ڕوومەت پەلکی هەڵاڵان
مەڕی هەر چوارە ماڵان
❃ مەشکەم دەژێ بە شەشان
لەسەر «کانێ وەنەوشان»
ڕۆن قابیلی چاوەشان
❃ کابانێ سست و مستی
لە بن مەشکێ دەنووستی
پشیلان چاویان دەلستی
❃ مەشکەم مەشکەی کاوڕی
«نێرخاسان» بە قوڕێ گری
ڕۆنی زۆر لێ ناگری
❃ مەشکەم مەشکەی مانگا قوڵێ
زارم بەستووە بە زەنگوڵێ

دەنگی دەڕوا بۆ «موسڵ»ێ

❁ مەشکەم دەژێ لە لێڕی

سەر گۆی مەمکم لە زێڕی

حەیران دەستیان تێگێڕی

❁ بەو قوڕعانەی «قاجر»ی

دەستم مەشکەی ناگری

حەیران چوو بۆ لەشکری

❁ مەشکەم مەشکەی نێنگوونێ

لۆلەپ لە دار زەیتوونێ

خۆی وێ هەڵدا «خاتوون»ێ

❁ بەری مەشکەم هەرزنی تاڵە

پشتی مەشکێم هەرزنی تاڵە

حەیران لە تاوان بێحاڵە

❁ ماڵمان دەچتە «نێرخاسان»

رۆنی دەگرین بە تاسان

لە بۆ لاوی «بڵباس»ان

❁ مەشکێم گەلێک نێوداره

«زازاک»م لــێ دیاره

بەیانە هێشتێ تاره

❁ ئاوی سپی کانیه

وازم لە مەشکەی نیه

حەیرانم لە ماڵ نیه

❁ مەشکە سووریٚ وا نابیٚ
کابان زیزە و چا نابیٚ
پێستی لە بۆ پڕنابیٚ
❁ ئاوی لە خڕ و زندۆڵان
ئاو دیٚ لە ملی کیژۆڵان
ڕۆن خۆشە بڕوا بۆوان
❁ مەشکە بژیٚ سیٚ گەردان
ڕۆنی دێنم لە بەردان
پیر بووم لەحەیفی دەردان
❁ مەشکە بژیٚ لە لێڕی
داردۆژەنگی لە زێڕی
بۆ خۆم کیژی باژێڕی
❁ مەشکیٚ بژیٚ ئێوارە
قالیچێکم بە دارە
پڕ لە نەخش و نیگارە
❁ مەشکەم مەشکەی کاوڕی
ئاو هاتە خوار لە چڕی
بازرگان ڕۆنیان کڕی
❁ مەشکە بژیٚ بە چواران
بە خرینگ و هۆڕیٚ گواران
ڕۆنی من دۆی بۆ سواران
❁ مەشکە بژیٚ چ خێرە؟

مەڕ گەییە دانە بێرە
کابان دەڵێی کەنێرە
❁ مەشکە سوورێم نەژاوە
وە کەف و ڕۆن گەڕاوە
کابان بۆیە داماوە
❁ مەشکە سوورێم هەواڵێ
لەبەر بایێی شەماڵێ
لەبەر گووڕمان دەناڵێ
❁ مەشکە مەشکەی بزنی
ئاوی لە بن کزنی
قابیل بە کوڕە مەزنی
❁ مەشکە مەشکەی گاڕەشی
هەڵیاندا لە «گاگەش»ی
لەبەر ڕۆنی دەقەڵشی
❁ مەشکە بژێ بە دووان
لە بن سێبەری تووان
ڕۆنی مە، دۆی بۆ شووان
❁ مەشکە بژێ بە سێیان
لە بن داری هەرمێیان
ڕۆنی من، دۆی فەقێیان
❁ مەشکە بژێ بە چواران
لە بن داری هەناران

ڕۆنی من و دۆی سواران
❁ مەشکە بژێ بە پێنجان
لە بن سێبەری وێنجان
بە تەشت ڕۆنم هەڵێنجان
❁ مەشکە بژێ بە شەشان
لە بن پۆلێ وەنەوشان
شان و ملم زۆر هێشان
❁ مەشکە بژێ بە حەوتان
لە بن نیسێی دار کەوتان
دوژمن لە حەیفان فەوتان
❁ مەشکە بژێ لە هەورازی
خۆشە دەنگ و ئاوازی
کاکم ژنێ دەخوازی
❁ مەشکە سوورە وا نابێ
چەرخی چیغم چا نابێ
خەسووم لێم ڕازی نابێ
❁ ئاوی «زەردە کیفار»ێ
بە خوڕە خوڕ دێتە خوارێ
لە بۆ مەشکەی نازدارێ
هەی ماڵە بابم مەشکێ
❁ ئەو شاخانەی دیارن
سەرێیان بە ژەنگارن

بنێیان بە خووسارن
هەی ماڵە بابم مەشکێ
❁ مەشکەی ناژێنم چڵکە
تەشێ نارێسم کولکە
ئەو ساڵ شەرتێکم کردبوو
بۆو لاوەی دەبمە ملکە
❁ سەری مەشکەم بەخێزە
کەوای دەورم بە زریزە
سەگبابە بۆ لێم زیزە
هەی ماڵە بابم مەشکێ
❁ مەشکەم مەشکی نێرەگای
مەڕ لە نواڵێ «شێ خەزا»ی
دەست لە من چاوت لە خودای
هەی ماڵە بابم مەشکێ
❁ مەشکەم ناژێ گرانە
سەد «بارزانی»م میوانە
حەیران شازی هەمووانە
هەی ماڵێ بابم مەشکێ
❁ مەشکە بژێ ئەمڕۆکە
نیمڕۆم لە بۆ تەواو کە
کاکم دێتە ئێرەکە
حەیران دەگەڵی شەریکە

❁ مەشکەم مەشکەی هانییە
وازم لە مەشکەی نیە
مەشکە ژێنم برسییە
هەی ماڵە بابم مەشکێ

❁ مەشکە دەژێنین بە چواران
بە خرینگ و هۆڕی گواران
ڕۆنی بۆ شۆڕە سواران
هەی ماڵە بابم مەشکە

❁ مەشکەم مەشکەی مامری
هانام وە «پیر خدر»ی
چیغمان لە پشت چادری
یا خوا مەڕمان لێ نەمری

❁ مەشکێم نێوداری گوێزە
ئەوگەنجە زۆر بزۆزە
بە جوانی خۆت سوێند دەدەم
مەشکێم بۆ بڵێ بە سۆزە

❁ ئەو ڕێیەی لە گەوەی دێ
بۆنی هەڵاڵانی دێ
ئەورۆ حەیران پێی‌دا دێ
هەی ماڵێ بابم مەشکێ

❁ بیری مەشکەی دەژێنێ
لێم کەوتۆتە کولێنێ

«ئامین» کوا ئاویٚ بیٚنیٚ؟
مەشکەم زۆری دەربیٚنیٚ
❁ مەشکەم مەشکەی مەڕکویٚرە
ڕۆن بۆ خۆم، دۆی بۆ خیٚرە
«ئامین» دەیژیٚنیٚ لیٚرە
هەی ماڵە بابم مەشکە
❁ هەی مەشکیٚ، مەشکیٚ
هەی ماڵە بابم مەشکیٚ
گا زەردی پیٚ بەخشکیٚ
ڕۆنی ئاغا و دۆی کەشکیٚ
❁ مەشکە سوورم وەی وەیە
چەندم دیٚنی و دەبەیە
لە کارانم دەکەیە
نان و ڕۆنم نادەیە
❁ مەشکەم دەژیٚ و نەژاوە
بای کویٚستانی لیٚداوە
وە کەف و ڕۆن گەڕاوە
کابانی لیٚ تۆراوە
❁ بەری مەشکەم چەند ئیشکە
پشتی مەشکەم چەند ئیشکە
گەڵا ئەسپینگ، تاڵیشکە
پیٚم خۆشە بانە مەشکە

❁ بەری مەشکێم چەند تەڕە
پشتی مەشکێم چەند تەڕە
کوێستان بە ئەسپینگ و سێوەڕە
پێم خۆشە بانەمەڕە
❁ مەشکەم مەشکەی کاوڕی
هەڵمانداوە لە چڕی
بازرگان ڕۆنیان کڕی
کابان لە خۆشیان فڕی
❁ «کادەرۆیشی نەڵێنێ»
بە بار ئاوریشمی دێنێ
بۆ گوریس و زارمبێنێ
بەشکم «نوسرەت» بیژێنێ
❁ نێوداری مەشکێم دارە
سەر و بنی بزمارە
سەردارم شۆڕە سوارە
کابانی حەکەدارە
❁ مەشکەم بژێ وا نابێ
سێ سوارت لێ میوان بێ
سەرکەردەی «عەلی خان» بێ
پێشڕەویان «سلەمان» بێ
❁ مەشکەم مەشکەی مەڕانە
دەیژێنم لەو هەیوانە

مەشکێ بژێ درەنگە
شۆڕە سوارم میوانە
❁ مەشکە سوورەم وەی وەیە
هێندەم دێنی و دەبەیە
لە کارانم دەکەیە
ڕۆنت هەر ئەوەندەیە؟
❁ مەشکە بژێ لە «لەند»ی
لە دەرکی دەوڵەمەندی
بە شەقەی بازی بەندی
ڕۆنی خۆشترە لە قەندی
❁ مەشکە سوورم گاڵ گاڵی
لەبەر بایە شەماڵی
هەرچی پێت هەڵدەکاڵی
لە ملان بچێ دە تاڵی
❁ مەشکە بژێ هانییە
کەف و کوڵی دانییە
«مەراغە» مەیدانیە
سەد سوار بە میوانییە
کابان بە قوربانییە
❁ مەشکەم مەشکی «بەسێ»یە
دۆی من و ڕۆنی فەقێیە
دەکوڕە دەستم لێ مەدە

دەشکێ شەقڵی بەهێیە
هەی ماڵی بابم مەشکێ
❁ مەشکەم مەشکەی گامێشی
لەبەر رۆنێ دەقەڵشی
ئەو ئیمامی «شافعی»
ئەو «بیلالی حەبەشی»
هێنامە بەر تۆ مەشکێ
❁ مەشکەم مەشکەی مانگایە
لۆلەپ لە دار خورمایە
شڵقی گەییە «بەغدا»یە
لەبەر رۆنی هەڵنایە
هەی ماڵە بابم مەشکە
❁ مەشکەم مەشکەی وشتری
بار دەکەین بۆ «پیرخدر»ی
چیغێم لە روی چادری
«زارا» رۆنی دەگری
ئەی ماڵە بابم مەشکێ
❁ نێوداری مەشکەم بییە
دەسرەی سەرم هەورییە
کلۆجەی بەرم قوتنییە
ئەورِو یار لە ماڵ نیە
کەیفم لە مەشکەێ نیە

❁ مەشکەم مەشکەی «نێرۆڵان»
تێی‌کەم ئاوی خڕ و دۆڵان
یا «شێخ قادری سندۆڵان»
مەڕمان نەمرن لە مۆڵان
ڕۆنی خۆشە بۆ ماڵان
❁ مەشکە مەشکەی بەرانی
هێندەی قەفی گۆچانی
هێندەی سەری شووانی
بەرکەی کەوێتە گیانی
کاکم بیخوا بە نانی
❁ خەسووم عەمری نەمێنێ
لە هەیوانێم دەنوێنێ
سبەینان زووم هەڵدەستێنێ
ئاوێ مەشکێم پێ دێنێ
ڕەببی ملانی دە قوڕێ نێ
هەی ماڵە بابم مەشکێ
❁ مەشکەم مەشکەی مەڕانە
ئەڵڵا لەو «نێرخاسان»ە
شۆڕەسوارم سەر هۆزە
«مامە سیامەند» سەر شوانە
هەی ماڵە بابم مەشکێ
دەک عەمرو چاوم مەشکێ

❁ مەشکەم مەشکێ گیسکۆڵێ
هەڵڵا دەوار زەندۆڵێ
کاکم هەڵگرێ زەردۆڵێ
هەستم دەچم لە تۆڵێ
هەی ماڵێ بابم مەشکێ
دەک عەمرو چاوم مەشکێ
❁ مەشکەم بژێ بە چواران
دەچمە کانییە «جانداران»
بە خرم و هۆڕی گواران
دەچمە پایزە هەواران
ڕۆنی دەگرم بە باران
هەی ماڵە بابم مەشکێ
❁ مەشکەی دەژێنم لە «لەند»ی
تێی دەکەم ڕۆنی «سەهەند»ی
هێندەی قەفی گۆچانی
هێندەی دووگەی بەرانی
هێندەی ڕۆن بێتە گیانی
هەی ماڵە بابم مەشکێ
❁ مەشکەم مەشکەی مانگایە
لۆلەپ لە دار خورمایە
دەیژێنم لە بێڵایە
ئەوڕۆ دەنگی چاک نایە

ئەی ماڵێ بابم مەشکێ
ئەی حەمر و چاوم مەشکێ
❁ مەشکێم لە دار هەنارە
کابان دەسرۆکەی لارە
دۆی زۆر رۆن بە تەغارە
مەشکێم زێڕی نێودارە
رۆنی مەشکێم بە بارە
شۆڕە سوارم لێ دیارە
❁ مەشکەم مەشکەی مانگایە
رۆنی زۆری تێدایە
کابان لە بەر بێڵایە
شڵقی لە مەشکەی دایە
هەی ماڵە بابی من بی
هەی عەمرو چاوی من بی
❁ ئەو شاخەی بەر بیزایە
تێیدا دوو کوڕە مەلایە
کرمانجە و رەنگ ئاغایە
رووی رەش بێ لە دنیایە
زۆر بێ مەیل و بەقایە
چ بکەم چی دەگەڵ نایە
❁ مەشکە مەشکەی مەڕانە
دارلۆپی چەندە پانە

هاوار کەنە خزمانە
ئەورۆ شەڕی مەشکانە
گوریس تێدا پسانە
قین بە قینەی بێریانە
❁ «مێرێ» مەشکێ دەژێنێ
لێم کەوتۆتە کولێنێ
کوا «ئەستی» ئاوێ بێنێ
مەشکێم زۆری دەربێنێ
ئەی مەشکێ، مەشکێ، مەشکێ
هەی ماڵە بابم مەشکێ
هەتیوە دەس مەبزێوە
بازنە لە دەستم دەشکێ
❁ مەشکەم مەشکەی مانگایە
مەشکەم زۆری تێدایە
«مێر» قۆچاغەی دەقۆڵ کرد
دەیژێنێ لە بەر بێلایە
وا کەوتوومە بەیانی
مەشکەم نایەتە ژانێ
دەرکەن مەڕ و بەرانێ
شل بۆوە زارەوانێ
❁ مەشکێم لە دار هەنارە
«مێرێ» دەسرۆکەی لارە

دایدا ڕێژنەی بارانێ
هەوەڵ مانگی بەهارە
مەشکێم زێڕی نێودارە
هەڵمواسی خوارە
شۆڕە سوارێم لێ دیارە
ڕۆنی مەشکێم بە بارە
مەشکێم گەلێک نێو دارە
بەیانە کەمێک تارە
بۆیە ئەسکوێ مل سوارە

باللۆرە
فەقێ عەولا

باللـۆرەی دەبێژم
پانۆکەت بە درێژم
❁ باللۆر بە شەماڵی
لفکەم حەرزی دەماڵی
ناکەم کوڕە خاڵی
❁ هۆ کوڕۆکە! کوڕۆکە!
سەر ... زەنگڵۆکە
بیگرە لە دمتی ڕۆکە

❁ لەسەر شاخە پانی
... قۆچەقانی
بە دمی کاکە شوانی
❁ شوانەی هەکێ و مەکێ
رندێن خوری شەکێ
دەمت بە بۆرەکێ
❁ شوانەی مەڕە زاوی
دانووم بۆ لێناوی
... بۆ تێناوی
❁ لەسەر کونە مارێ
پێتدا بەرمە خوارێ
سێ مانگەی بەهارێ
❁ خیزم، خیزم، خیزم
کیژێکی ئازیزم
دە دمی بابت میزم
❁ لە سەر دار ئەسحابی
قیڕەی کەڵەبابی
... ئاقڵ نابی
❁ باللۆرەی بە لێوان
شەڕی توولە مێوان
حازر بە بۆ جنێوان
❁ کوڕی «شای قەجەر»م

خەنجەر لە کەمەرم
هاتووم ئەتۆ بەرم
❁ کیژێ حەڕەبیمە
بەژن دارە بیمە
بە تۆ رازی نیمە
❁ شوانۆکەی بەڕێوە
کیسە و قەننە پێوە
ماچی کە ئەو لێوە
❁ باللۆر بازی خانی
ئاوا بووم لە بانی
لە سوێی کوڕە حەیرانی
❁ هۆی هەتیوەی گولەکە
چۆغەکەت رەشبەڵەکە
... بخۆ و دەنگێ مەکە
❁ چاوت چاوی سەقر و بۆقی
لەدوات دەکەم گورگە لۆقی
ناتگەمێ دڵم تۆقی
❁ کیژێ لەوێ ژێرێ
بەردان هەڵوێژێرێ
بیژوان پێ وەشیرێ
❁ کوڕی لەوێ بەرێ
رندێن کلکی کەرێ

برام لە ... بەرێ

❁ کیژێ لە لاباسکی
مەمکت سەر توێی ماستی
بۆ برای خۆم دەخواستی

❁ دەتبەمە بن شاخی «تەرەغە»ی
بۆت رادەخەم شاقەلی چۆغەی
هەر من ... تۆ بڵێ ئۆخەی!

❁ بریا کۆنە کەوا بام
دەبەر لینگانیدا بام
بە ... دڕابام

❁ باللۆرەی بە لێوان
شەقەی توولە مێوان
شەو خۆشە لە کێوان

❁ گاوان بە گۆپاڵەوە
حەوت ژن بە منداڵەوە
حاڵ بێ بە ئەحواڵەوە

❁ دەڕۆم بەرەو بایە
دەدرووم نەرمە گیایە
بۆ ئەسپی تاقە برایە

❁ لەسەر شاخی «گاگەش»ی
«مەنگوڕ»ی یا «مامەش»ی
چبکەم جەرگەم بۆت دێشی

❁ من لەو بەری نیری
تۆ لەو بەری نیری
... لەسەر پەنیری
❁ ئەتۆ لەو بەری چۆمی
ئەمن لەو بەری چۆمی
مەڕۆ یارێ خۆمی
❁ شوانەی شەکە مێیە
وەرە سەرە رێیە
دەتدەمێ بەهێیە
❁ ئەتۆ لەو بەری کەڵەکێ
ئەمن لەو بەری کەڵەکێ
... لە سەر پشتی مانگا بەڵەکێ؟
❁ دەڕوا بەرەو کوێستان
مەمکی قیت راوەستان
بوون بە باخ و بێستان
لە بۆ خزم و دۆستان
❁ لە سەر دارە زێنێ
کۆللارە دەخوێنێ
هەرچی نێوم دێنێ
قەت کەسی نەمێنێ
❁ لەسەر شاخە پانی
مەمکت وەک فینجانی

وەک «بڕنوو»ی دەتکەم لە شانی
خواردنی ئاغا و کرمانجانی
❁ تۆ لەو بەری ڕێیە
من لەو بەری ڕێیە
پڕپڕ لە ریشت بڕیم
تا دەگاتە سەر ڕێیە
بەندی مانگا دۆشین
هاجەر کولتەپەیی

مانگا دۆشین داب و نەریتی تایبەت بە خۆی هەیە. نەنکم زۆر جار دەگێڕێتەوە: «گامێشە زەردێکمان هەبوو، لە دایکم بەدەر کەس نەیدەوێرا تخوونی بێ. ساڵێکی واهات دایکم خوشکی عەمری خودای کرد و بۆ سەرەخۆشیێ چۆوە «خاتوونباغ»ێ. دایکم کە حاڵاتی گامێشە زەردی دەزانی یەک ڕۆژزیاتر لە وێ گیر نەبوو. ماڵتە ئەو تاقە ڕۆژەی ئەخت و چارمان کرد بواری هەر نەدا بیدۆشین. هەر چەند بە زمانی دایکم بۆی دەلۆراینەوە دیسان هەررانەدەوەستا و جیفڕکی لە خۆی دەدا و بە هۆقە هۆق و نەڕە نەڕ، بە گوانەوە دەچۆوە بەندەنێ».

مانگاکەم لە کوێستانێ
خواردوویە ئاوی کانێ
شیر و دۆی بۆ کابانێ
❁ مانگام مانگای نەخشینە

پشت ڕەش نێو چاوان شینە
قوربانی بێ «هەمین»ە
❁ مانگام مانگای هەژاران
شیر دەفرۆشین لە شاران
بە دوور بێ لە ئەغیاران
❁ نەنێ، نەنێ مانگا کاڵەکەمی
بنەی ماڵ و حاڵەکەمی
ڕۆنی زەنگ بۆ کوڕەکەمی
شیری سەر ئاورگەکەمی
❁ بۆیە پێم خۆشە کەژی بەهاران
مانگا زەرد دەگرێ سەر چڵی داران
مانگا شێتەکەم کەوتە ئێواران
بە خێر بێتەوە ئەوڕۆ لە گاڕان

حـەیـرانـەکـان لـە زمـان ئـایشێ مەلازادەی، ئایشێ حەلـی حەیزی، پوور بەسێ، رەسووی نادری، مەناف عەبدوڵڵازادە، قادری عەزیزی و خەجێ نان‌نەخۆر، وەرگیراوە.

حەیرانێ وەرە لە کێوی «ئادێ»
مەندۆک هەڵدەستا
ئافتای کووڕادێ
حەیران ئاوا بوو
لە خۆم بێ مرادێ
❁ حەیرانێ وەرە لە «کانێ شێخ»ی
دەرزیلەی زێڕەو
ریشوان تێک دێخی
دەبەر ئەو مەلایەی دەمرم
دڵی من و کوڕە حەیرانێ رێک دێخی
❁ حەیرانێ وەرە لە چۆلی «شام»ێ
پاتۆڵ شینێ، بەرگ نیزامێ
خۆ من گەلێ بە دڵم حەز لێدەکرد
بەڵام هەزار مەخافەتی دە کاولە دنیایەم خودا نەیدامێ
❁ حەیرانێ وەرە لە خۆم رەبەنێ
دراو بە کۆشەی زێڕ بە لەگەنێ
ئەتۆ چ خوشکۆڵەی دە دای و بابیت نینە
ئەگە بیدەیەوە لەبەر خوێنی من

ئەمیشت بە ماڵۆکەی دنیایە نادەنێ
❁ حەیران لە لێڕان، لە لێڕی بازی
ئەمن دەگەڵ ورچێ چوومە دە غارێ
سەد خۆزگەم بە بەرازی
دە ولامێکم بۆ بەرنەوە کن هەتیو حەیرانی
ئەوە لە ماڵە گولێکی دە مێردان دانیشتووم
بە دڵێکی زۆر ناڕازی
❁ ئەستێرێک هەڵدێ لە من لە ناوەندی دە عاسمانێ
ئاورێکم بەربۆتە دەروونی دەروونەخانێ
نە بە بای دەگوژێتەوە نە بە بارانێ
کەس نیە ولامێکم بۆ بداتە هەتیو حەیرانێ
بێت و ئازادم کا لەوێ زیندانێ
❁ ئەستێرێک هەڵدێ لە لای «یەمەن»ێ
«پێروو» هەڵدێن «تەرازوو» نایگەنێ
کەپرێکت بۆ دروست دەکەم لە سوورە گوڵێ
پەرژین لە ڕەشەڕیحانێ
هەرامی لە گوڵی دە کاولە مەوتەنێ
ئەمن ئەوە لە ماڵە بابان دانیشتووم
ئاخان هەڵدەکێشم، کەلەکان دەگۆڕم بە تاقیتەنێ
❁ ماڵە بابی من و ماڵە بابی هەتیو حەیرانێ بەرامبەرن
دوو کێلی دە شین، دوو کۆترە باریکەی لە سەرن
حەزلێکردوویی کچ و کوڕی خۆشە

بەڵام دەست لێک بەردان داخ و کەسەرن
❁ حەیرانێ وەرە لە «کێلەڕەشان»
سەد بریا دەسکێک گوڵ بایەم دەگەڵ وەنەوشان
ناوەڵڵا مەلای دوازدە عیلم بام
بردبایانمەوە سەر نەخۆشان
❁ ئەوە لەشکرێک هەستاوە لەشکری حاکمی تەیە
سەتی حاڕەبە، سەتی نیزامە و سەتی فەلەرەشکەیە
یاڕەبی خودایە هەتیو حەیرانی من بەجێ نەمێنێ لە جێی شەڕگەیە
❁ حەیرانێ وەرە سەری «قەڵاتی شای» لە من بەتەمە
لە سەرەوە خوداوەندی عالەمیانە و لە بنەوە پیرەمەمە
ئەگەر چارەی من و کوڕە حەیرانێ لێک نووسرابێ
لە مێژە پێی‌دا هاتۆتەوە قەڵەمە
❁ حەیرانێ وەرە سەری «سیاقۆڵ»ی لە من بە گۆمە
لایەکم حەجەمە و ئەوی دیکانەم نیزام و رۆمە
ئەگەر بە حەوت مەلای دە دوازدە عیلمم
مارەکەنەوە لە گولەکەی دە گولە مێردان
ئێستا هەر ئی کوڕە حەیرانێ خۆمە
❁ حەیرانێ وەرە لە لای «رەبەت»ێ
ئەمن دەچوومەوە ماڵە بابی کوڕە حەیرانێ
هەر بە بیانووی چووکەڵە حاجەتێ
ئەوە دایکی کوڕەتیو حەیرانێ بۆم دەهات
هەر وەکوو ئاورەکەی دە قودرەتێ

❁ حەیرانێ وەرە لە «کانێ شوبری»
بۆم بڵێن بە دایکی کوڕە حەیرانێ
ئەوە نە نوێژان بکا و نە ڕۆژووان بگری
ئەگەر بمداتەوە بە کوڕە حەیرانێ
وەبزانێ دەست بە ئاڵقەی کابەی دەگری
❁ حەیرانێ وەرە لە باسکۆڵێ بە قاللۆرە
ڕەبی لەسەری بابی کوڕە حەیرانێ بێ سندان و
لە زگی دایکی بێ ڕەقە ناسۆرە
ئەوە خوێنی منی ماڵ وێرانیان بۆ هێندە پێ زۆرە؟
❁ حەیرانێ وەرە لە کانیلەی «مام خاڵ»ێ
کوڕە حەیرانی من دێنێ ژنێ
ئەوە بابی وێی ناداتەوە ماڵێ
ئەمن تەڵەبێ لە خوداوەندی عالەمیان دەکەم
حەوت ساڵان لە بەندی حەجەم و ڕۆمێدا بناڵێ
❁ حەیرانێ وەرە چۆمەکی «گاگەش بابۆمەران» زۆرە لە من بوار نادا
سواری ئەسپەکەی خۆت بە ڕکێفان لێدە
ئەوە هەتا کیژ بووم لە ماڵی دە بابان نەتخواستم
ئەلحانیش گولەکەی دەمێردان لە بۆ تۆم تەڵاق نادا
❁ حەیرانێ وەرە لە دارە ئیشکێ
کەفەڵ مامزێ، دامێن کەروێشکێ
ئەمن بە تۆ دەڵێمەوە کاکە و
ئەتۆش بە من بڵێوە خوشکێ

شەیتان و شوفار زۆرن
هەتا پێمان نەبەنەوە شکێ
❁ حەیران وەرە لە کانیلکەی دە «کانیمیران»
ئەمن گاجووتی ماڵە بابی خۆ دەکەمە خێری فەقیران
ئەگە بە سێ مانگەی پایزێ و سێ مانگەی بەهاران
ماڵە بابی من و کوڕەتیوێ ببنەوە جیران
❁ ئەوە دەڵێم حەیران...
سێبەری شاخان لە من دێتەخوارێ
لە باسکان، لە بەندەنان، لە دەشتان هەڵدەبری
ئەمن ناکەم گولێکی، دەکەم حەیران
لە کوێستانی عەزیمەت بۆی هەڵدەدەم چادر
ناوەڵلا دەگەڵ سابات و کەپری
ئەوە سینگم قۆنگرە و قەڵات و مەتەرێزە
لەشکرەکەی کا «حومبەر»ی دەگەڵ کاکە «مەلا»ی لە بنی دەوری
ئەمما کاکە «مەلا» لەوان دای و بابانە بووە
خوداوەندی میری مەزن بۆ منی ناردۆتە خوارێ
دەگەڵ رێژنەی دە بارانێ و کلوو کلووی دە بەفری
❁ سوارە بە سواری خۆت دەشوبهێنم
بەیانە، سەحەرە، زەندێ بە بازن و قامکی بە ئەنگوستیلەت لەبۆ
رادەوەشێنم
سوار ئەگەر ئەتۆ میوانی رۆژێ بی
چات لە قولکێ بەرگەردنێدا لەبۆ دەکولێنم

ئەگەر میوانی شەوێ بی
لە نێوانی سینگ و مەمکێتدا دەنوێنم
❁ حەیران دەڵێم «بیتوێن»ی رەنگین لە من ئاورێکی بەربۆتێ
ئەمن سەد شەکی بەر بەرانییم ببێتە خێری مەولوودی پێغەمبەری
ئەگەر ماڵێ هەتیو حەیرانێم بەوێ ئاورێ نەسووتێ
حەک رەبی ماڵە بابم قەت کەسیان نەمێنێ لە بابانێ
وەسەر کەوتن بۆ سەربەنی دە کوێستانێ
ماڵە هەتیو حەیرانێ هیچیان بە سەر نەیە
ئەو ساڵ بەجێ ماوە لەسەر هەوارە جووتێ
❁ حەیران دەڵێم لە دەربەندی «بازیان»ێ
ئەوە بریا هەر ئەو زەمان بایە
ئەگەر ماڵە بابی من لێیان دەنا بۆ تیلەگە تیلەگی دە کوێستانێ
ئەنگۆ خەبەرێکی بدەن بە هەتیو حەیرانی
ئەوە گولێکی دە گولەمێردان دوو دانە رۆژە لە ماڵێ نیە
دە با بێ بە دەستی چۆپەم بگری شەمامە و شەمامەی باغەڵێ
دە عەدەعەدی دە نیوە شەوێدا دەستی راستەم باوێتەوە سەر کەزییەی دە لاملانێ
❁ حەیران دەڵێم کوڕە ماڵ وێران
ئەوە «هەولێر» لە من «هەولێر»ە
لە سەرەوە تاقە و لە بنەوەی باژێڕە
ئەوە سینگی من دووکانی «خواجە حەسەن»ێ
ئێوارە و سبەینان دەستەکەی خۆی تێگێڕە

❁ حەیران دەڵێم ئەمن نەخۆشم دەردم دوو دەردە
ئەوە بە سەر ماڵی بابێ هەتیو حەیرانێم وەر بووە
دەستێ عارەب و رۆم و جەردە
ئەتۆ هەڵمگرە لە ماڵۆکەی دە گولەمێردان
یان دەستۆکێ خۆتم لێ بەردە
❁ ئەوە پایزێک لە من دادێ گەلێک پایزێکی لە من درەنگە
ئەمن لێوم دێنن بارێ، ددانم دەدەنەوە ژەنگە
خۆ ئەمن ئەوان کوڕە لاوان لە کوێستانان نانێژم
بە سەری‌دا دێنە خوارێ کلوو کلووی دە بەفری
ئەمن ئەوان کوڕە لاوان
لە نێوانی سینگ و مەمکی دە خۆم دەنێژم چ بکەم بیرازی تەنگە
❁ ئەو جار دەڵێم بەردی دە بەردەبێران دە شینن، دە خڕە
نێری و بەرانی دە وان حاکمە ماڵان
لێک دەمشێنن و لێک دە مکوڕە
بەڵام ئەوە تووڕ و شیرمەشکان لە منی دە کارمامزان مەدڕە
❁ ئەمن دەڵێم ئاڵقە و گواران نانێرم بۆ هەتیو حەیرانێ
ئەگە بیانکاتەوە دە تۆقی تفەنگێ
ئەوە چەند رۆژە جووتێک «شەمامەی روستەم‌بەگی»یانم
بۆ هەڵگرتووە لە بن کراسی، دەرزیان لە سەری دەدەم
دەڵێم هەتا هەتیو حەیران نەیەتەوە لە سەفەرێ وەدەریان ناخەم
هەتا چی دی هەڵنەیەننەوە غوبارێ دەگەڵ ژەنگێ
❁ ئەوە دەڵێم ئەمن پۆلێکم شۆڕەسوار و حدوودسوار دەدیتن

دایاندەبەشێوە ڕەشەڕاوە
بەختی منی ماڵوێرانێ قەلەندەر هەڵیاندەستاندەوە جەیرانە
ئەمن لە وان سواران خورد دەبوومەوە
سەرزینیان بە شەجەرن، دانەلغاویان مروارین، ساساکاری گەرمێنێن
نەمناسی سەرڕاوی ئەوان هەتیو حەیرانە
ڕەبی خودایە دای و بابی من خوداگیرم بن
پێناودارم بن ڕۆژبازاڕی قیامەتێ
ئەگە نەیانهێشت هەتیوە لاوەکەم
ئەوشۆکانە لە سەر سینگ و مەمکۆڵەم پکەم بە میوانە
❁ بابە شەڕە، هەڵڵایە، شەڕ کەوتەوە ناو دێیە
بڵێن بە هەتیو حەیرانێ تفەنگێ خۆی حەمبار کا
دەمانچەی خۆی بێنێتەوە سەر پێیە
پشت دە غەنیمێ خۆی نەکا
«ئەسمەر»ێ «کاک بایز»ی چاو لێیە
❁ حەیران دەڵێم ئەوە پایزە و وەعدی وەیە شوانان شەرتیان هەڵێ
ئەتۆ وەرەوە کن ماڵە بابێ خۆم
ئەمن دەتدەمێ مانگ و سەتمەنێ
بەڵام لە دوایی ساڵێدا
دەتکەمە شەریک و برابەشی شەمامە و شەمامۆکەی دە باغەڵێ
❁ حەیران دەڵێم دەستێ منوو بە داوێن بێ
ئەوە پایزە و گەلاوێژ لە من دەبزۆزێ
ئەوە پۆلێکی سوارانم لێ وەدەر دەکەوێ

پێشیان دەخەملێ بە سوورە گوڵێ و دواییان بە نەرمە تۆزێ
تو خودا لێی گەڕێن شەش مانگی زستانێ
هەڵمگرێ لە گولێکی دە گولەمێردان
دەگەڵ شەوی دە نەورۆزێ
❁ حەیران دەڵێم ئاوی دارە هەنارێ
بەسەر وردەخاڵی گەردنێتدا دێنە خوارێ
ئەمن ئەو ساڵەکانە حەوت دانە ساڵە
لە دوای قەفی سمێڵی شۆڕە سوارێ عەبداڵم
هەر بیکەمەوە پەرەنگۆڵەی دە گوارێ
❁ دەڵێم حەیران بریا گوڵێک بام لەوی دە کەس نەناسی
شین ببام لەسەری «هەباسی سڵەمان»ی
لە نێوانی «مەنگوڕ» و «بڵباس»ی
نەوەڵڵا لە «مۆڵەبەرانان»، لە سەری «قەندیلی مامە کۆییان»
ئەگەر خەڵکی یار کۆڵەی من ناناسی
ئەوە هەموو بەیانان دێتە سەررێیە بە تویێی دە کراسی
❁ حەیران دەڵێم ئەتۆ لە سەر دووکانان قەنەوزی
لە نێو سوارانم خاسی
ئەتۆ خۆم لە بۆ ماوێوە جێی دە حاسی
هەڵتدەستێنم بەسەر رەوی تاوسی
❁ ئەمن دەڵێم کەروێشکم کەروێشکی خواری
نە بە شای دەگرام، نە بە خونکاری
بە هەتیو خۆم دەگرام بە شەوی دە تاری

❁ حەیران دەڵێم ئاوی لە کوێستانان لە من دێنە خوارێ هەر بە تیژی
بە سەر سوێسنە و هەڵاڵە و بەیبوونی دە سەر بە گژنیژی
ئەنگۆ خەبەرێکم بۆ بدەن بە هەتیو حەیرانێ
ئەوە حەوت دانە ساڵە لە ماڵە بابم دانیشتووم هەر بە کیژی
❁ حەیران دەڵێم لە «مێرگەڕۆ»یە
ئەسپی کوڕە حەیرانێم هاتە سەر پاشوان دەکا نسکۆیە
بریا سینگی من تات و تاتەبەرد بوایە
لێی کردباوە هەر چوار فەڕزان کوڕە حەیران دەگەڵ نوێژی دە نیوەڕۆیە
❁ گەلی دە دۆستان!گەلی دە برادەران!
ئەمن حەیرانێکی دەڵێم بە وێ خەمباری
ئەوە ڕەبی دای و بابی من چ خۆشیان لە خۆ نەبینن
نەیانهێشت لە دنیایە حاسڵ بێ مرادم
نەیاندام بە کوڕە حەیرانێ، دەم لە سەر تۆپی «جانبێزار»ی
ئەگە لە سێباری شەوێدا تێکەڵ کەین سمێڵ و بسکان؛
هەرامەتی هەر لە پشت دیواری
❁ حەیران بای دێ بە خودای لە من شەماڵە
لە سەرانم هەورە، بایە،تەمە،تومانە
لە دامێنانم سووکە سامالە
ئەوڕۆ گولێکی دە گولەمێردان لە ماڵێ نیێ
کوێر بم هەتیو حەیران لە کوێی
بە خودای کەلێنۆک بەتاڵە
❁ حەیران لە چۆلان، لە چۆلی دە «شام»ێ

ئەوە سەڵا و سێسەد سەڵای دە دنیایەم لێ رابوو
دوێینێم خەبەری هەتیوە لاوێ خۆ زانیوە
بە دەستێکە نیزامان دەیانبرد بۆ بن داری ئێعدامێ
شەرت بێ دەچمە سەر تێلان، تێلگراڤان، کن پیاو ماقووڵان
ئەگەر تکایەم نەگرن، خۆم داوێمە بن ئاڵای «رووس»ی
حاشا دەکەم لە وێ دینێ ئیسلامێ
❁ حەیران دەلیم دیسان، شەڕە، تەقەیە، هەڵڵایە
لە پشتی «نەشکۆڵان»، لە «بێور» و «بێوران»،لە «کوڕبناو»ێ
دەستی منتان بە دامێن بێ
پێی بڵێن بە وێ حەجەمێ تو خوداکەی چی دی تفەنگان ناوێ
ئەوە هەتیو حەیرانی من لە سەنگەرێ دا
کاکۆڵی ژەنگاوی بوون بە تۆزی و بە ئارەقێ
ناوێرێ سەر هەڵێنێتەوە لەبەر گوللان
سوور بۆتەوە لەبەر تاوێ
❁ هەتیو ئەتۆ نەتدەکوت سبەینێ سوارانم بۆ سوار کەوە
تفەنگچییانم بۆ بدەوە لە سانێ
ئەتۆ نەتدەکوت ئەمن نەماوم بۆ «ئەسمەر»ی ئەوێ «کاک بایز»ی؟
نەماوم لەبەر نازان، لەبەر غەمزان، لەبەر پەرەنگی گوارەی
ریشۆڵەی دە پیرە شەدانێ
تازە دەڵێی مردنم گەلێ گەلێ پێ خۆشترە
نە وەکوو بۆم بێننەوە خەبەری یار بە شوودانی؟!
❁ ئەوە پایزە محەللی شوانان شەرتیان هەڵێ

هەتیو وەرەوە کن ماڵە بابی من بە شوانی
مەڕێ خۆت هەڵدێرە لە بۆ نێو «سوورچی»یان،«زوراری»یان،
«خێڵەڕەشی»یان
لە منی ماڵ وێران لە بۆ کلکەی پاش «کۆدەڵ»ێ
ئەمن سوێندێکە خواردوومە هەموو شەو و نیوەشەوان
دوگمێ سینگ و بەرۆکێت لە بۆ دەترازێنم
تەرخانت دەکەم لە شەو رامووسانێ
ناوەڵلا لە جووتێک شەمامەی دە باغەڵێ
❁ رەبی بابە ئەمن دوعایەکت لێ دەکەم
خودا چ نەکا، چ نە سەبرێنێ
هەتا دوعای منی سەرشینێ، قەلەندەرێ، بابان وێرانێ پێکدێنێ
رەبی بابە گەنمی دەکەی زیزانەی بێنێ
برینجی دەکەی داڕووجانی بێنێ
ئەمنت داوە بە پیسی هەموو پیاوان
شەو هەتا رۆژ پشتی خۆم پێ دەخورێنێ

ئەم بەندانە لە زمان مەریەمئەخجوستی، ئایشێ
مینەی کاکی، زارای سمایلیشەپان وەرگیراون.

ئەمن دەگەڵ توومە شلکەشوانی شەتڵ نەهاتوو
بریا قەت نەمدیبایەی بە وان رۆژان
خۆ بە خودای کێلانت لە بۆ دێنم لە نوالان، تابووت لە لا بەر رۆژان
ئەمن بۆ کوڕە لاوێ خۆم قەبرێکی هەڵدەقەنم؛
لە نێوانی سینگ و مەمک و بەرکۆژان
❁ بریا ئەمن قەتم نەدیبایە شلکەشوان بە وان زەمانان
کێلانت لە بۆ دێنم لە «حەڵەب»ێ، تابووت لە لانوالان
ئەمن قەبرێکی لەبۆ هەڵدەقەنم لە نێوانی سینگ و وردەخالان
❁ ئەمن دەچمە سەری کاولە «کۆسرەت»ی
ئەوە دێنم گیابەند و خاوێ بە بێتاقەتی
لە بن سەرێ بریندارێ خۆم دادەنیشم
باوەشێنی دەکەم هەر بە بێمنەتی
❁ هەی رۆڵە، بابی دایە! هەر لەوڕۆ و هەر لە دوێنێ
دەسکی خەنجەری توومە زەردە لە دیوی گەرمێنێ
رەبی ئەوان کەسانەی راپۆڕتیان لە کوڕی من دا
دە باغەڵێیدا راوەستن گۆمیلکۆڵەی دە خوێنێ
❁ ئەوە لە من دێن بە کوڵووکە جووتێ هەر بە کوڵووکە جووتێرێ
دەڕوێ لە زاری دە هۆزان، لە بن بەردی دە بەردەبێرێ
ئەوە کاکی دە من نەماوە ئەگە دەگەڵ ئەوان کوڕەلاوان؛

به لفکه و سۆرانییان بکا هاوێرێ
❁ ئەوە بابی دایە خۆ لە بۆم بگرن رادۆ و دەنگی نەواران
خۆ ئەوە بەهار نیە ماڵ بچنەوە هەواران
ئەورۆ کوڕە لاوی دە خەڵکی دەگرن دۆستان
کوڕە لاوێ من بەر دەدەنەوە یاران
❁ ئەمن دەڵێم زێوێکی مەرزان لە من دێت و دەبەزی
نە بە شەپۆلانم دە وەدەدا لە کەندی، هەر لە بناری دە رەزی
بەڵام حەیفە کوڕە لاوی وا دە زیندانی «رەزایە»ی‌دا نەڕزی!!
❁ ئەوە ئەستێرێک هەڵدێ قەت ئاوا نابێ
پێمێردی دە خودای سواران قەت پیادە نابێ
ئەمن چ بکەم لە بەژنێ باریک و چاوێ بەڵەک خۆش نابێ
❁ ئەوە تفەنگەکەی کاکی دە من لوولە مارە
خۆ بە خولای ئەمن نازانم نە «بڕنوو»یە نە «جان‌بێزار»ە
بەڵام لە برینی برینداران‌ت کەوی
قەت خۆت وەبەر دەستی دوژمنی مەدە، هەڵێ ئەو شارە و شارە
❁ ئەستێرێک هەڵدێ گەلاوێژ لە من دە گازێ
بابی پووری «حەسەن جەنگەڵ»ی لە گەرمێنی
بە قوڕێ گیراوم لە بۆ دەکاتەوە زێ
خۆ بە خولای یار و یارکۆڵەی دە وان کوڕە لاوان
لە خۆ حەرام دەکەن
زولفی دە بە خەنە دەگەڵ چاو رشتنی دە سبحەینان و پشتێن بەستنی ئێواران

ئەوە دەڵێن هەتا کوڕە لاوێ خۆن دێتەوە لە «شیمال»ی بە قوڕێگیراو
دەگەڵ کەس ناکەینەوە جێژنە پیرۆزە
❁ ئەمن دەڵێم تفەنگێ کاکی خۆم لوولە زێوە
دە جا توخودا بابی دایە خۆ تفەنگی خۆم لە بۆ هەڵەنگێوە
ئەدی لە بۆ لە چنگی دوژمنی دەرباز نابی و ناڕۆی ئەو کێوە و کێوە؟
❁ ئەوە مەجالان لە من دەکوتا، هەر مەجال کوتنێ
لە سەری زمانم با بێ هەر کوانێ سووتنێ
ئەگە زەینێ خۆم دەدا «پانەسەر» و «دوو سەران»
سۆسنە و هەڵاڵە و بەیبوونی لێدەگەنێ
ئەو جێیەکی ئەگە برینداری من بکا تەڵەب
خوا شوکر سەریان لێهەڵدەقەنێ
❁ ئەمن دەڵێم لەوێ نۆرێ هەتا ئەوێ نۆرێ
ئەوە مەڕ و مێگەلی خۆیان راکێشان بۆ سەر گۆلی دە بەرخ شۆرێ
ئەتۆ دای و خوشکی دە خۆت نەبوون
لە بۆتیان ناردبانەوە بە دیاری هەر دۆڵاغ و گۆرێ
❁ ئەمن ئەوە دەڵێم «رەزایە»ی وێران لە من بە تاقە
ئەوە سوورە گوڵ سوور دەبوون
رەشەڕیحانە لە من دێنە دەرێ بە گوڵە مێلاقە
بەڵام ئەتۆ نازانی هەتا دێیەوە لە گەرمێنێ
یار و یارکۆڵەی تۆ لەماڵی دە بابان هەر بە مارە و تەڵاقە
❁ ئەوە لەشکران لە من منەمنە
ئەنگۆ ئەوان قۆنگرە و قەڵاتان باوێنە سەر ملی دە منە

به تۆفیقی خولاوەندی موبین لەبۆو دەشکێنم قەلات و قۆنگری دە پۆلا و ئاسنە

❁ ئەوە ئەمن دەچمە سەر شاران، هەرامەتی سەر بازێڕی
دەگەڕێم لە حەکیمان، لە تەبیبان، هەرچی دەرمانی دەگێڕی
ئەگە حالەم دەکرێ بە زێوان
ئەمن لە بۆ برینداری خۆمی دەکڕم بە زێڕی

❁ ئەوجار دەڵێم بابەکەی بابم ئەوە بەهارە بە هەوا
دە مەڕ و مێگەلانم کەوتووە گەرمەزەوە
دەنا بە سەری توو ئەمن دەنگێ ناکەم
لە بۆم مەگرە بەرخۆڵەی دە بۆر و پتەوە

❁ ئەمن هێندم لە زاری هێندم لە باڵن
هێندێکم خەونن، هێندێکم خەیاڵن
بەلام رۆڵە بابی دایە
زیندانی «رەزایە»ی لە داوێ بەتاڵن

❁ ئەی خودا هاوار! ئەی موسوڵمانان!
کوڕم کوژراوە
بە پیرەسەری جەرگەم بڕاوە

❁ هەی «رەحیم» «رەحیم» «رەحیم»!
چارۆکەی تەختم «رەحیم»
مجری بێ بەختم «رەحیم»
دەڵێن «رەحیم» نەماوە
خوێنی لەوێ رژاوە

خەنجەر لەویَ چەقاوە
دەسحێب لەویَ بڵاوە
❁ هۆی «بەردە هەڵۆ» و دۆڵەکەی «بەسری»
تا دەگا بەنگۆ، عاسمان بۆم دەگری
❁ شەمامە دەڕوا گوڵم دەمێنی
گوڵیان هەڵقەندووم کەسم نامێنی
❁ ئەی هاوار! هاوار!
جەرگم بڕاوە
جووتەی کوڕانم
شەهید کراوە
❁ «قەڵای مەریوان» پاڵم دا پێوە
قەڵاکەم رووخا پاڵ دەم بە کێوە
❁ خۆ بابم «بایز» بۆ تۆ ناگریم
سەر لە سەرینیَ
بۆ «رەحمان» دەگریم
دەگەڵ «رەحیم»یَ
دەستی هەرتکیانم لەسەر برینیَ
❁ «رەحیم» گیان، کوتم بووکت بۆ دێنم
تازێی «رەحمان»ی بە تۆ دەشکێنم
خەبەریان هێنا «رەحیم» کوژراوە
لە کووچەی «سەعدی» درێژ کراوە
❁ ئەمن کاکە گیان دەردو ناتوانم

خەبەرێ بەرن بۆ خوشکەکانم
سێ دەسماڵ بێنن بۆ برینانم
حەکیمێک بێنن بکا دەرمانم
❁ «رەحمان»م دەڵێ:
لە کێوی «ئادێ» کەوتووم ناتوانم
خوێن سەری کردۆ لە چەکمەکانم
❁ رۆڵە سەد جاران بە روحی «حەبەشی»
خودای تەعالا دڵی لێم دێشی
بەڵام من چبکەم کارم کراوە
«رەحیم» گیان ئەورۆ لە جەرگمی داوە
❁ لانکێکی بۆ دروست دەکەم لە لانکی دە بیزایە
خۆ رەبی دەستمان شکێ
ئەو دارە گەلێک ناسکە
لە کاتی راژاندنێ هیچ دەنگێکی لێ نایە
❁ دایە گیان هەستە دەست دە دەسرەکە
نیسکێ لە دەردی دڵم رەها کە
❁ خەڵکی «قەرەداغ» خۆت و خوداتان
کوڕم منداڵە کەوتۆتە لاتان
قەدری واجبە لەسەر هەمووتان
❁ «رەحمان» گیان یا خولا هیچ کوێت نەهێشێ
دەردی گوللەکەت دایکت بیکێشێ
❁ ئەی خودا هاوار ئەی موسوڵمانان!

چارەسەرم کەن بۆ برینداران

❁ دەسکی داسەکەت داری خاسەڕەنگ

حەک بۆت نەمێنم کوڕی شۆخ و شەنگ

❁ چەندم پێ کوتی مەچۆ «قەڵات»ێ

شەڕە، هەڵلایە، لە «مەهابات»ێ

تفەنگە «شەشخان» گوللە دەتگاتێ

❁ خەبەر بەرن بۆ خزمانم

ئاورێک بەر بۆتە خەرمانم

دەنکێ نەما بۆ دەرمانم

شێواوە دەری بابانم